ناوی کتێب : مرۆڤ و ژیان
نوسەر : کاروان سلێمان کاکەمەد
بابەت : لێکۆڵینەوە
بەرگ : پێنجەم
تایپ : نوسەرخۆی
نرخ : دیاری یە
دیاری یە بۆ /........................
بەرواری :   /   /

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپارد
نی (٦٧٣)ی ساڵی (٢٠١٨)ی پێدراوە.

**لەبارەی هاوسەرگیری و ژیانی خێزانی :**

**(ن) دەڵێ : ((ڕاست نییە بڵێم نەبوونی منداڵ کاریگەری لەسەر ژیانی ڕۆژانەم نەکردووە بۆنموونە لەکاتێکدا دەچینە ماڵی برای یان خوشکی خێزانەکەم یان پاڕك و بازاڕ لەوماوە یەمنداڵ دەبینی ، کەدەگەڕێینەوە ماڵی خۆمان هەست دەکەم خێزانەکەم لەڕووی دەروو نییەوە ئاسوودەنییە لەلایەکی ترمن بیرلەوەدەکەمەوە لەپاش مردنم مولك ومالّم بۆکێ د ەبیت ؟ و هەست دەکەم هەوڵ وکۆشش و ژیانم بەفیڕۆچووە ، بەلاّم تارۆژی مردنیش هەر بەئومێدی ئەوەم منداڵمان ببێت و بیریشم لەوە نەکردۆتەوە ژنێکی تربێنم))٠**

**(س) دەڵێ : ((یەکێك لەوشتانەی دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی خۆشەویستی بریتی یە لەو ەی کەکاتێك پیاودەگەڕێتەوە ماڵ خێزانەکەی بەرەوپیری دەچێ و هەرچی بەدەستییەوە بێت لێی وەردەگرێت و خێرا پەرداخێك ئاوی پێشکەش دەکات))٠**

**(ح) دەڵێ : ((گلەیی پیاوان ئەوەیە ، کەژن بەبێ لێکدانەوەی داهات و دارایی پیاوەکەی یە کسەرداوای ئەوشتانەدەکات کەدراوسێی وخزم هەیانە، تائەویش هەیبێت واتاچاولێکەری))٠**

**هەروەها دەڵێ:((گرفتێکی ترئەوەیە هەندێ لەژنان نەخوێندەوارن یان خوێندەوارییان هە یە ، بەلاّم حەزبەخوێندنەوەونووسین ناکەن ، لێرەدا ژنەکە حەزدەکات باسی خزم و دراو سێی و شت کڕین بۆمێردەکەی بکات ، بەلاّم پیاوەکە دەیەوێت باسی زانست بکات لێرەدا بەریەککەوتن و پێچەوانەی بیروڕاز یاد دەکات و زۆرجارکێشەی لێدەکەوێتەوە))٠**

**(س) دەڵێ : ((یەکێك لەشێوازە هەڵەکانی پەروەردەکردنی منداڵ بەنازبەخێوکردنی مندا ڵە ، کەدەبێتە هۆی پشت نەبەستن بەخۆی ، کەمانای جێبەجێکردنی هەموو ئارەزووێکی منداڵ))٠**

**(ن) دەڵێ : ((وشەی سوپاس گرینگی خۆی هەیە لەژیانی خێزانی دا ، چونکەکاتێك هاوسە رەکەت سوپاست دەکات هەست بەگرینگی کارەکەت دەکەیت و هاندەرێکە لەسەرکاری باش بۆیە ئافرەت هەرکارێك بۆپیاوەکەی بکات چاوەڕێی ئەوەیە پیاوەکەی دەست خۆشی لێ بکا ت و سوپاسی بکات))٠**

**(د) دەڵێ : ((ئەگەرچی لەنێوخانەوادەدا زۆرکەم سوپاس بەکاردێ ، بەلاّم ئێمە لەماڵەوە بە کاری دەینین و من هەست دەکەم بەهۆی ئەم وشەیە زیاتر لەهاوسەرەکەم نزیك دەبمەوە ،**

**یەکترمان خۆشتردەوێ))٠**

**(ك) دەڵێ : ((زۆرجارئەوانەی بڕوانامەیان هەیە دەچن ئافرەتێك دەستنیشان دەکەن بێ بڕ وانامەوکچی ماڵەوەبێ ، بەڕای خۆیان زاڵ دەبن بەسەرئافرەت و دەسەڵاتیان دەبێ))٠**

**(خ) دەڵێ : ((ئافرەت بەشەرم ونەرم ونیانی جوانتردەبێ نەك بەنواندنی کرداروڕەفتاری پیا وانە))٠**

**(س) دەڵێ : ((ڕەزیلی ئافاتێکی گەورەیە بەتایبەتی لەنێو خێزان دا ، کاتێك باوك ڕەزیلی د ەکات منداڵەکانیان ، منداڵی هەرزەکار لەوانەیە پەنا بۆدزیکردن ببات))٠**

**(ی) دەڵێ : (( مرۆڤی واهەیە زۆربەرچاوتەنگە ، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لەنێوان ڕەز یلی و پاشەکەوتکردن))٠**

**(ف) دەڵێ : ((ڕەزیلی ئەوکاتە زۆرناشیرینە کەپیاوان خاوەنی ئەوسیفەتەبن))٠**

**(ئا) دەڵێ : ((فرەژنی دەتوانێت گرفتی قەیرەیی چارەسەربکات))٠**

**(ه) دەڵێ : ((هەرگیزلەو بڕوایە دانیم ، کەپیاوژنی دووەم بۆئەوەبێنێ قەیرەیی نەهێڵێت ، بەڵکو بۆمەسەلەی چێژوەرگرتنە لەئافرەت تەنها بۆساتەخۆشەکانی خۆیەتی))٠**

**(ش) یەکێکە لەوئافرەتانەی هاوسەرەکەی ژنی دووەمی بەسەرهێناوە دەڵێت : هاوسەرەکەم بەخۆشەویستی منی هێنا ، بۆماوەی (٨) هەشت ساڵ پەیوەندی خۆشەویستی لەنێوانمان دا هەبوو ، ماڵەوەمان لەسەر ئەوپڕۆسەیە ڕازی نەبوون بەڵام من زۆرپێداگریم کرد ، تەنیا ساڵێك چاوەڕێی کرد ، کاتێك کەزانی منداڵمان نابێت بەبێ ئەوەی پرسم پێ بکات ژنی بە سەرهێنام کاتێکیش ژنی دووەمی هێنا بەهەمان شێوە منداڵیان نەبوو))٠**

**(ك) دەڵێ : (( پەیوەندیم لەگەڵ ماڵی خەزوورم خراپە ، چونکە خەسووم تەداخولی ژیانی ئێمەی دەکرد و دەیگووت : فلاٌنە کچ ئەوەندە مسقال زێڕەی هەیە ، ئەوی دیکە ئۆتۆمبێل و خانووی هەیە ، کچی منیش هیچی نییە ، ئەوقسانەش منیان نیگەران دەکرد بۆیە دوای بیرکردنەوەیەکی زۆر بڕیاری پچڕاندنی پەیوەندیم لەگەڵدان))٠**

**(ل) وەکو ئافرەتێك دەڵێ : ((من بەهاوسەرەکەم دەڵێم ببورە کەهەڵەیەکم بەرامبەری کرد بێ یان دڵم شکاندبێ وە پێشی دەڵێم سوپاس کەیارمەتی منی دابێ ، بەڕاستی جوانترین و شە لەلای من وشەی سوپاسە))٠**

(ئە گ) دەڵێ : (( ساڵانێك بەرلەئێستا كوڕێك داوای كچەكەمی كرد منیش بەهۆی زانیاریم لەسەرئەوكوڕە زۆربەتوندی بەرامبەر داوای خزمایەتی ئەوكوڕە وەستام ، بەلاّم ئەوكوڕە بە هۆی قسە پان و لووسەكانی توانی دڵی كچەكەم بۆلای خۆی ڕابكێشێ وخێزانەكەشم قەناعە ت پێ بێنێ دوای بینەوبەردەیەكی زۆرڕازی بووم كچەكەم شوو بەوكوڕەبكات ، بەلاّم بەمەر جێك هەتاهەتایە سەردانمان نەكات و نەیەتە ماڵمان٠جارێكیان لەناكاوی و دوای گەڕانەوەم لەسەفەرێك بینیم لەماڵی ئێمە وەك كوڕی ماڵ لێی دانیشتووە ، منیش بەوهەڵسووكەوتەی ڕازی نەبووم ، چونكە بەومەرجە كچم پێدابوو كەسەردانمان نەكات ئەمەش بووەمایەی در وستبوونی كێشەوگێروگرفتێكی گەورە لەنێوان من وخێزانەكەم٠پاشان زاواكەم و كچەكەم و خێزانەكەم و كچەكەم بوونە یەك و دژی من وەستان٠خێزانەكەم وتی : لەمەودوا دەبێ بێن و لەماڵی ئێمە لەگەڵ ئێمەش ژیان بەسەربەرن ، منیش وتم : ئەوشتە قبوول ناكەم ، دەبێ بڕیاربدەی ژیان لەگەڵ مندابەسەربەری یان لەگەڵ ئەوان٠بەداخەوە ئەوبڕیاری ژیانی لەگە ڵ ئەواندا ، منیش ماڵم بۆزاوای نەگریس جێهێشت ئەوە بۆ (٩) نۆساڵ دەچێ ماڵ ومنداڵە كەم نەبینیوە ولەحالەتێكی هەڵپەسێردراوداماومەتەوە ، چونكە لەئاینی ئێمەدا (مەسیحی) ناتوانی نەژن تەلاق بدەی ، نەژنی تریش بێنی))٠

(   )دەڵێ : ((ژنی پیاوی موسوڵمان ئەگەرجولەكە یان گاوربێت مافی چوونە كلێساوپەرستگا كانی خۆیان هەیە و مێردە موسوڵمانەكەی مافی ئەوەی نییە ڕێی لێ بگرێت ، چونكە درود ی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((اتركوهم ومایدینون))٠واتا : ((وازلەخۆیان وئاینەكەیان بهێنن))٠وەنابێت زۆری لێ بكرێت وازلەئاینەكەی خۆی بهێنێت{لااكراه فی الدین} البقرة : ٢٠٦ واتا : (زۆرلێكردن لەئاین دا نییە)٠

(س) دەڵێ : ((ئەگەردایك وباوك ناچاربوون منداڵەكانیان بخەنە سەركار لەبەر دەستكورتی پێویست دەكات كارێك بۆمنداڵەكانیان بدۆزنەوە كەلەگەڵ تەمەن و عەقلیان بگونجێ وكاری ترسناكیان بۆنەدۆزنەوە وەكوكاركردن لەناوخوێن وچەقۆ (قەسابی)، چونكە كاریگەری خرا پی بۆدروست دەكات٠ئەومندالاّنەی كاری سەربڕینی ئاژەڵ دەكەن ڕەنگە لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنیان فێری توندوتیژی ببن بۆیە واباشە منداڵ كاری قەسابی نەكات٠لەسەردایكان وباو كان پێویستە منداڵەكانیان لەم جۆرە پیشانەدووربخەنەوە ، منداڵ ئەگەركاریش بكات پێو

یستەلەژێرچاودێری دایك وباوك دابێت ئەویش نەك هەمووجۆرەكارێك٠
(ڕ) دەڵێ : ((ئێمە خێزانێکین لە (٩)نۆکەس پێکهاتووین پیاوەکەم فەرمانبەرە سەرە مانگا ن کاتێ مووچە وەردەگرێت بەشێکی کەمی بۆخۆی دەگێڕێتەوە ئەوی دیکەش بەمن دەدات تابیکەمە مەسرەف))٠
(ن) دەڵێ : ((پیاوەکەم کاسبەو حەوت نەفەرین پیاوەکەم ڕۆژانە پازدەهەزاردینارم دەداتێ منیش دەیکەمە مەسرەف))٠
(ن) دەڵێ : ((من و پیاوەکەم هەندێ جاربەیەکەوە دەچینە بازاڕو پێداویستییەکانی هەفتە یەك دەکڕین وئەگەرپێویستیشمان بەشتێك بوو تەلەفۆنی بۆدەکەم لەگەڵ خۆی دەیهێنێتە وە))٠
(س)دەڵێ : ((بێگومان خێزان دەزگایەکی سەرەکییە بۆپەروەردەکردنی منداڵ بەپلەی یەکە م دایك و باوك بەرپرسیارن ، چونکە هەرلەسەرەتاوە ئەومنداڵە لەژێردەستی ئەوان پەروەر دە دەکرێت بۆیە دەبێ بەشێوەیەکی چاك ئامۆژگاری منداڵەکانیان بکەن ، قوتابی هەیە هە ڕەشە لەمامۆستا دەکات ئەگەرمنداڵ لێپرسینەوەی لەسەرنەبێ و چاك ئامۆژگاری نەکرێت ئەم جۆرە ڕەفتارانە ئەنجام دەدات))٠
(ك) دەڵێ : ((ئەوخێزانانەی کەدەستکەوتی مانگانەیان بەپێی پلانێکی ڕێك و پێك خەرج دەکەن دەتوانن مانگانەبۆکاتی پێویست پاشەکەوتێك بکەن یان هەرنەبێ بگەنەوە سەرەما نگ ، بەڵام ئەوخێزانانەی بێ پلان داهاتی مانگانەیان خەرج دەکەن لەوانەیە لەنیوەی ما نگ پارەیان پێ نەمینێ و تووشی قەرزاری ببنەوە و بەئاسانی لێی ڕزگارنەبن))٠
(ئە) گەورە کچێکە تەمەنی حەفتا ساڵە دوای پەککەوتنی برا و براژنەکەیان بردوویانەتە خانەی بەساڵاچووان ، ئەگەرشووی کردبا ڕەنگە ئەمڕۆ لەوێ نەدەکەوت٠
(ع) پیاوێکی تەمەن (٦١) ساڵە لەخانەی بەساڵاچووان ژیان گوزەردەکات ، دەڵێ : (( لەتەمە نی گەنجێتیمدا هەڵەیەکی زۆرگەورەم کرد ژنم نەهێنا))٠
(ڕ) کوڕێکە دەستگیرا نداره دەڵێ : ((بڕیارمان داوە لەگەڵ دەستگیرانەکەم ڕۆژی ئاهەنگێڕا نەکە بخەینە (١١/١١) ، چونکە من گرینگی بەبەرواری جوان دەدەم بۆئەوەی هەرگیزلەبیرما ن نەچێتەوە))٠

(گ) دەڵێ : ((کاتێك دایك و باوك لەماڵ دەردەچن دەبێ هەمیشه لەگیرفانی منداڵەکەیان کاغەزێك هەبێت ، تیایدا ناوی منداڵەکەو ناونیشانی ماڵ و ژمارەی تەلەفۆنی تێدا تۆمار کرابێت بۆئەوەی کاتی بزربوون پەیوەندییان پێوە بکرێت))٠

(ك ش) دەڵێ : ((زۆرگرینگە دایك وباوك کاتێك جل وبەرگ وکەل وپەلی قوتابخانە بۆمندا ڵەکانیان دەکڕن ، منداڵەکانیان لەگەڵ خۆیان ببەن بزانن چ جۆرە جانتاوکەرەستەیەکی بە دڵە ، چونکە ئەو ڕەنگ و جۆرانەی ئێمە حەزیان لێدەکەین مەرج نییە منداڵ حەزیان لێ بکات ، چونکە لەوانەیە منداڵ بەدڵی نەبێت ئەوکات یان دەبێت بەزۆرمنداڵەکە ناچاربکر ێت کەپێی ڕازی بێت یان بیگەڕێنێتەوەوهی تربکرێت بۆیە دەبێ ڕاوبۆچوون وحەزووئارە زووی منداڵ لەبەرچاوبگیرێ))٠

(ك) دەڵێ : ((دایك وباوك هەڵەیەکی زۆرگەورەدەکەن ئەگەرمنداڵ بۆخوێندنی زانستی هان بدەن تواناوزیرەکیشی لەخوێندنی زانستی نەبێت ،چونکە لەوانەیە لەخوێندنی زانستی سە رکەوتوونەبێت بەدووسێ ساڵ لەکۆتاییەکەی لەپەیمانگاوەربگیرێت))٠

(ك) دەڵێ : ((نابێت دایك و باوك منداڵەکانیان بکەن بەلایەنێك پاڵ بەمنداڵەوە بنێن لایە نی دایك یان باوك))٠

(ك) دەڵێ : ((کاتێك دایك و باوك منداڵ لەشیردەبڕێننەوە وڕای دەهێنن لەسەرنان خواردن ووازهێنان لەشیر ئەم پرۆسەیە دەبێ قۆناغ بەقۆناغ و لەسەرخۆجێبەجێ بکرێت واتا یەکە مجار لەگەڵ شیرخواردن هەندێك خواردنی بدرێتێ ، دواتر زیادبکرێت و بڕی شیرەکە کەم بکرێتەوە دوای ماوەیەکی ترخواردنە شلەکەی بۆبکرێت بەڕەق ڕۆژلەدوای ڕۆژ بڕی خوارد نەکەی بۆزیادبکرێت وبڕی شیرەکەی بۆکەم بکرێتەوە))٠

(ك) دەڵێ : ((گەورەترین هەڵەی دایك و باوك منداڵ داوای هەرشتێك بکات دەست بەگریان و کەللەڕەقی بکات دایك وباوك بۆبێدەنگ کردن ملکەچی داواکارییەکانی دەبن ئەمەدەبێتە هۆی چاندنی تۆوی عینادی و کەللەڕەقی لەناخی منداڵ دا ، بەڵکوهەندێك جارداواکارییەکا نی منداڵ ڕەت بکرێتەوە هەندێ کاتیش بەپێی توانا داواکارییەکانی منداڵ جێ بەجێ بکر ێت ، هۆی ڕەتکردنەوەش بۆمنداڵ ڕوون بکرێتەوە))٠

**لەبارەی ئەوبابەتە ئایەت و فەرموودەی زۆرهاتووە :**

**دایك و باوك دەبێ بەردەوام هەوڵ بدەن بۆچاكسازی منداڵەكانیان ، خوای گەورە دەفەرموێ :** {يأيهاالذين امنوا قوا أنفسكم وأهليكم نارا وقودها الناس والحجارة}التحريم : ٦

**واتا : (ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتان هێناوە خۆتان و خاووخێزانتان بپارێزن لەئاگرێ كەسوو تەمەنییەكەی مرۆڤ و بەردە)٠**

**لەبارەی ئەوئایەتە وتراوە واتا خاوو خێزانتان چاك پەروەردە بكەن٠**

طبراني **دەگێڕێتەوە ، كە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((لايدع أحد كم طلب الولد ، فاءن الرجل اذامات وليس له ولد انقطع اسمه))٠

**واتا : ((هیچ كەس لەئێوە واز نەهێنێت لەداواكردنی منداڵ ، چونكە ئەگەرمرۆڤ مرد مندا ڵی نەبوو ناوی دەبڕێتەوە))٠**

**ڕاڤە / ئێمە ناوی باوك و باپیرمان لەسەركتێب و دەفتەرەكانمان دەنووسین ، لەقوتابخانە و جگە لەقوتابخانەش ناوی باوك و باپیرمان دەخوێندرێتەوە٠**

**حاكم ڕیوایەتی كردووە ، كە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ئافرەتێكی بینی كە دوو كیژۆڵەی لەگەڵدابوو ، یەكێكیانی هەڵگرتبوو ، ئەوی تریشیان دەستی گرتبوو ، درودی خو ای لەسەربێ فەرمووی :** ((والدات حاملات رحيمات ، لولا مايأتين الى أزواجهن ، لد خل مصلياتهن الجنة))٠

**واتا : ((دایكانێك بەسك هەڵیان گرتوون و میهرەبانن ، ئەگەرلەبەرئەوە نەبێت كە بەسەر مێردەكانیان دەهێنن ئەوا نوێژكارەكانیان دەچوونە بەهەشت))٠**

**كارێكی زۆرمەترسیدارە دایك یان باوك دوعا لەمنداڵەكەی بكات ، درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((لاتدعوا على أنفسكم ، ولا تدعوا على أولادكم ولاتدعوا على خدمكم ، ولا تدعوا على أموالكم ، لاتوافقوا من الله ساعة فيترل فيها اعطاء فيستجاب لكم)) رواه أبوداود٠

**واتا : ((دوعالەخۆتان مەكەن،دوعا لەمنداڵەكانتان مەكەن ، دوعا لەخزمەتكارەكانتان مەكە ن ، و دوعالەماڵ و سامانتان مەكەن ، نەبادا هاوكاتی ئەوساتەبێ كەخوای گەورە نزای تێدا گیرادەكات و دوعاكەتان گیرابێت))٠**

**عومەری کوڕی خەتتاب (خوالێی ڕازیبێ) جارێکیان پیاوێکی بەسالآچووی بینی دەستی شه لەل بوو ، پێی وت : دەستت چییەتی ؟ کابرا وتی : لەسەردەمی جاهیلیەت دا باوکم نزای لێکردم دەستم شەلەل لێی بدات نزاکەی گیرابوو شەلەل لێی دا٠ئیمامی عومەر (خوالێی ڕا زی بێ) وتی : ئەمە نزای باوکانە لەجاهیلیەت دا دەبێت نزایان لەئیسلام دا چۆن بێت ؟ کاتێك منداڵێك لەماڵێ دا قاپێك دەشکێنێت پێی دەڵێن دەستت بشکێ ، گەرئەم نزایه بەر ساتی گیرابوونی نزابکەوێت ئایا قاپێك نرخی دەستێکی هەیه ؟**

**یاریکردن لەگەڵ منداڵ دەروونی گەشه پێدەدات، درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((من کان له صبي ، فليتصاب له))

**واتا : ((هەرکەسێك منداڵێکی هەبوو باخۆی وەك منداڵەکه لێ بکات و یاری لەگەڵ بکات))٠**

**ئەبوهورەیره (خولێی ڕازیبێ) لەپێخەمبەری خواوه (درودی خوای لەسەربێ) دەگێڕێتەوه که فەرموویەتی :** ((لايقل أحدكم أطعم ربك ، وأسق ربك ، وليقل : سيدى ، مولاي ، ، ولا يقل أحدكم : عبدي ، أمتي ، وليقل : فتاي ، وفتاتي ، وغلامي )) رواه البخاري ومسلم وأبوداود وأحمد٠

**واتا : ((٠٠٠٠٠٠٠باهیچ کەس لەئێوه نەڵێ : بەندەکەم بابڵێ : کوڕەکەم ، کچەکەم))٠کەواته ئاساییه منداڵ بانگ بکرێ : کوڕەکەم ، کچەکەم ، ڕۆڵە ، لەگەڵ منداڵەکانی خۆی یەکسانیا ن بکات بەسۆزوبەزەیی و زمان شیرینی بانگیان بکات٠**

قرطبی **دەڵێ : ((گوێڕایەلی دایك و باوك ڕەچاوناکرێت لەئەنجامدانی تاوانی گەوره یان واز هێنان لەفەرزێك ، بەڵکو گوێڕایەلییان لەرێگه پێدراوەکان دەبێت))٠**

**درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی :** ((أمك ، ثم أمك ، ثم أمك ، ثم أباك))

**واتا : ((دایکت ، پاشان دایکت ، پاشان دایکت ، پاش ئەوه باوکت))٠**

"أبی بطال" **وتوویەتی : پوختەی مەبەست ئەوەیه کەدەبێت دایك سێ هێندەی باوك چا کەی بەرامبەربکرێت٠ وتراویشه کەچاکبوون بەرامبەریان وەك یەکەو یەکسانه ، بەلأم جه ماوەری زانایان وتوویانه دایك پێشدەخرێت٠**

**دایك و باوك بۆیان هەیه کەشتێکیان بەخشی بەیەکێ لەمنداڵەکانیان دواترلێیان بسەننەوه** ترمذی **گێڕاویەتییەوه کەپێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((لايحل لأحد أن يعطى عطية فيرجع فيها الاالوالد لولده)) ورواه ابن ماجة والبيهقي٠

**واتا : ((دروست نییە بۆهیچ کەسێ کەشتێکی بەخشی لێی پاشگەزبێتەوە و وەریگرێتەوە تە نهاباوك نەبێت بۆی هەیە لەمنداڵەکەی وەریبگرێتەوە))٠**
**درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((من الكبائر شتم الرجل والديه))
**واتا : ((لەگوناهەگەورەکانە کەمرۆڤ جنێوبەدایك و باوکی بدات))٠**
**چ بەخۆت جنێویان پێبدەی یان جنێوبەدایك و باوکی کەسێك بدەی ئەویش لەبەرامبەر دا جنێوبەدایك و باوکی تۆبدات یان کارێکی وابکەی تورەببن و جنێو بەخۆیان بدەن٠**
**لەنیشانەکانی چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوك حەجکردنە لەبرِی هەرکامیان لەبەرهۆکار ی تەندروستی کەنەتوانن بیکەن یاخود ئەگەرمردبن ، ئافرەتێك وتی : ئەی پێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) : باوکم پیاوێکی بەساڵاچووە توانای حەج و عومرەو رۆ یشتنی نەماوە ، پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرمووی : ((حج عن أبيك)) حەج بۆباوکت بکە٠**
**بوخاری و موسلیم و نسائی و ئەبوداود لەعبداللەی کورِی عەبباس (خوالێی رِازی بێ) دە گێرِنەوە پیاوێك بەپێخەمبەری خوای وت : دایکم مردووە ، ئایاخێری بۆبکەم سوودی پێ دەگەیەنێت ؟ فەرمووی : بەڵێ٠پیاوەکە وتی : ئەوا تۆشاهێدبە کەحوشترێکی پشت نەکرا وەم هەیە واکردم بەخێربۆی٠**
طبرانی **لە** (الأوسط)**دا گێرِاویەتییەوە کە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویە تی :** ((ماعلى أحد اذا أراد أن يتصدق بصدقة أن يجعلها لوالديه اذاكان مسلمين فيكون أجرها ويكون له مثل أجورهما من غيرأن ينقص من أجورهما شي ء))٠
**واتا : (( هیچی تێناچێت لەسەرهەرکەسێك کەویستی خێرێك بکات بیکاتە هی دایك و باو کیشی گەرموسوڵمان بوون ، پاداشتەکەی بۆدایك و باوکی دەبێت و خۆیشی وەك ئەوان پادا شتی بۆدەبێت بەبێ ئەوەی کەهیچ لەپاداشتی ئەوان کەم بێتەوە))٠**
**دەربارەی لێدانی منداڵ ، زۆرلێدانی منداڵ دەبێتە هۆی زیان پێگەیاندنی ئەندامەکان ، هەر وەها شوێنەواری خراپی لەسەرگەشەی دەروونی وفیکری منداڵ دروست دەکات وە ئامانج لە لێدان بۆ(تأديب)ە بۆ(تعزيب)نییە تۆڵەکردنەوەنییە بۆئەوەیە بەرِەڵلانەبێ وەزۆرترین لێدا ن نابێ لە (١٠)دە لێدان زیاتربێت٠بوخاری رِیوایەتی کردووە کەپێخەمبەر (درودی خوای لە سەربێ) فەرموویەتی :** ((ولايجلد فوق عشرجلدات الافي حد من حدود))٠

واتا : ((لە (١٠)دەلێدان زیاترلێنادرێت مەگەرلەسنوورەکان (حەددەکان) نەبێت))٠
مامۆستاش لە (١٠)دە دارزیاترلەقوتابی نەدات ، چونکە منداڵ دەترسێنێ ئەگەرمنداڵ یان قوتابی ناوی خوای هێنا یان وتی : (توخوا٠٠٠) ئەوادەبێت واز لەلێدان بهێنرێت و دەستی لێ هەڵگرێت ، چونکە ئەومنداڵە گەیشتۆتە قەناعەت کەهەڵەی کردووە یان گەیشتۆتە قۆناغی ئێش و ئازارێك کەتوانای بەرگە گرتنی نەبێت یان گەیشتۆتە قۆناغی دارمانی دەروو نی یان ترسێکی زۆر٠
(ك ش ق) دەڵێ : ((بەڵام لێدانی بەردەوامی منداڵ و بەردەوام فشارخستنە سەرمنداڵ مامە ڵەیەکی ڕاست نییە ، هەندێك دایك و باوکیش زۆر بەنەرمی مامەڵە لەگەڵ منداڵ دەکەن و لەهەڵەوکەم و کورتییەکانیان ناپێچنەوە ئەومنداڵانە هیچ کات هەست بەلێپرسینەوە ناکەن بۆنموونە ئەگەرمنداڵ شەڕی کرد و دەستدرێژی کردە سەرمنداڵی دراوسێکەیان باوکی هیچ قسەیەکی پێنەوت ئەومنداڵانە سەرەڕۆولاساردەبن))٠پێشینان وتوویانە : (شەرحی ماربەدا ر) ، لەهەمان کاتدا وتوویانە : (ماربەقسەی خۆش لەکون دێتەدەرەوە)٠
لە ئیبن عومەرەوە دەگێڕنەوە ، کەدرودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((لاترفع العصا على أهلك وأخفهم في الله)) رواه الطبراني٠
واتا : ((دارلەخێزانت بەرزمەکەوە لەخوای گەورە بیانترسێنە))٠
کەمنداڵ چاك و خراپی لێکجیاکردەوە دایك و باوك دەست دەکەن بەفەرمانکردن بەنوێژکر دن ،درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی:((اذاعرف الغلام يمنه من شماله فمروه بالصلا ة)) رواه الطبراني٠
واتا : ((ئەگەرمنداڵ ڕاست و چەپی خۆی زانی و لێکی جیاکردنەوە ، فەرمانی پێبکەن نوێژ بکات))٠نیشانەی دەرکەوتنی عەقلیش حەوتساڵییە٠درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : (( مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع ، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر وفرقوا بينهم في المضاجع)) رواه أبوداود والحاكم٠
واتا : ((منداڵەکانتان لەحەوت ساڵی فێری نوێژبکەن ، وەلەدەساڵی لەسەرنوێژنەکردن لێیان بدەن ، وە جێگای خەتنیان لێکجیابکەنەوە بالەژێریەك نوێندا پێکەوە نەخەون))٠
لەبارەی بردنی منداڵ بۆمزگەوت منداڵ نوێژی هەینی لەسەرپێویست نییە، بەڵام بۆڕاهێنا نی لەکاتێکدا منداڵ دەبرێت بۆمزگەوت کەبتوانێت خۆی بچێتە سەرئاوو خۆی پاکژبکاتەوە

**ومیزوپیسایی نەکاتە ژێرخۆی وەپێشتریش چۆنیەتی هەڵسوکەوتی ناومزگەوتی فێرکرابێت لەبەهێمن جولانەوەوپێلاٌودانان لەشوێنی دیاریکراوی خۆی دا٠**

**ئیمام  ئەحمەد و** ترمذی **له لە(خوله کچی حکیم) گێڕاویانەتەوە کەپێخەمبەر (درودی خو ای لەسەربێ) یەکێك لە منداڵەکانی کچەکەی لەباوەش دەکرد و دەیفەرمoو :** (( والله انکم لتبخلون ، وتجبنون وتجهلون ، وانکم لمن ریحان الله))٠

**واتا :((وەللاٌهی ئێوە هۆی ڕژدی و ترسنۆکی و نەزانین، هەرئێوەش لەڕیحانەکانی خودان))٠**

**زمخشری دەڵێ : چونکە منداڵ باوکی تووشی ڕەزیلی دەکات تاسامانەکەی بمێنێتەوە بۆئەو ، ترسنۆکیشی دەکات لە ترسی ئەوەی نەوەك بکوژرێت دوای خۆی منداڵەکانی بێ ساحێب بمێننەوە ، ڕیحانن چونکە ئەوان بۆن دەکرێن واتا ماچ دەکرێن٠**

**هەروەها پێویستە دایك و باوك منداڵەکانیان بەرلەڕۆژئاوابوون بێننە ژوورەوە ، درودی خو ای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((اذا جنح اللیل فکفوا صبیانکم فاءن الشیطان تنتشر حینئذ)) رواه أحمد والبخاري ومسلم و أبوداود والنسائي٠

**واتا : ((کەشەوداهات منداڵەکانتان مەهێڵن بچنە دەرەوە ، چونکە شەیتانەکان لەوکاتەدا بلاٌ ودەبنەوە))٠**

## ئافرەت و بەکارهێنانی ئاو :

ئاو وەها پێناسەکراوە کە شلەیەکی بێ تام وبێ بۆن و بێ ڕەنگە٠ژیان بەئاوەوە پەیوەستە لەدووگەردیلەی هایدرۆجین وگەردیلەیەکی ئۆکسجین پێکدێ ، سێ دۆخی هە یە : شلی ، ڕەقی ، گازی٠زانایان بەدوای ئاودەگەڕێن لەمەریخ دا ، چونکە کاتێك ژیان هەیە ئاوهەبێ٠ ئاو هۆکاری سەرەکییە بۆبەردەوام بوونی ژیانی مرۆڤ و ڕووەك و گیانلەبەر بۆ مەبەستی خواردنەوە ، خۆشووشتن ، ئاودان ، ٠٠٠هتد٠سەرچاوەکان پێشبینی دەکەن ململانێی نیوان ولأتان لەداهاتوودا لەسەرئاودەبێت٠کەم ئاویش نەك هەرکاردەکاتە سەرکشتوکاڵ ، بەڵکودە بێتە هۆی کەم بوونەوەی کارەباش٠بۆیە ئاو پێداویستییەکی سەرەکی ژیانە و بەنرخترین بەخششی خوایە بۆمرۆڤ و کەم بوونەوەی ئاویش گرفتی زۆرگەورە دروست دەکات٠

ئاوچارەسەرە بۆهەندێك نەخۆشی ، ئاولەگەڵ جوولە ، ئەییوب پێخەمبەر(علیه السلام) کا تێ نەخۆش بوو خوای گەورە دوو چارەسەری بۆداناوە : {واذکر عبدنا أیوب اذ نادی ربه أنی مسنی الشیطن بنصب وعذاب (٤١) ارکض برجلك هذا مغتسل بارد و شراب (٤٢)}ص : ٤١ ـ ٤٢

واتا : (٠٠٠ بڕۆ بەپیادەڕۆیی و ڕابکە و بەئاوی سارد خۆتی پێ بشۆوبیخۆرەوە)٠

هەندێ لەئافرەتان زیاد لەپێویست ئاو بەکاردەینن لەبەڕێوەبردنی ئیش وکارەکانی ناوماڵ٠ وەهەندێ لەئافرەتان چێژ لەوکاتانەوەردەگرن کەسۆندە بەدەستەوە دەگرن٠

هاولأتی (ڕ) ماوەی چەند ساڵێك بوو لەگەڕەکی (ش) دەژیا ، خانووەکەی لەبەربێ ئاوی فر ۆشت٠

لەگەڕەکی ( ) هاولأتی (د) دەڵێ : ((لەبەربێ ئاوی جارجاردەچینە ماڵی کەس و کارمان لە وێ دەمینێینەوە))٠

لەگەڕەکی (م) هاولأتی (م) دەڵێ : ((ئاومان لەهاوین دا وەهایە))٠

(م) دەڵێ : ((شەوانە نۆبە دەگرین هەتا نیوەی شەو ناخەوین))٠

(ل) دەڵێ : ((جاری وایە یەك هەفتە ئاونایەت))٠

(ك) دەڵێ : (( نزیکەی هەفتەیەکە ئاوبەبۆڕی گەڕەکەکەمان دا نەهاتووە کەچی گەڕەکی پشت ئێمە هەمیشە سۆندەیان بەدەستەوەیە ، حەوشەوسەربان وئۆتۆمبێل دەشۆن دەڵێی گەراجی غەسلیان داناوە ئێمەش ئاومان دەست ناکەوێ))٠

**(م) دەڵێ : ((بەفیڕۆدانی ئاو دیاردەیەکی ناشارستانییە دەبێ هەمووومان هەوڵی پاراستنی ئاوبدەین ، چونکە شاربەردەوام لەفراوانبوون دایە ، ژمارەی دانیشتوانیش لەزیادبوون دا یە))٠**

**(س) دەڵێ : ((بێگومان ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمیشە لەقورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ئامۆژگاری کردووین ، کەئیسراف نەکەین٠ دیارە ئاو یش یەکێکە لەپێداویستییە هەرەگرینگەکان ، واخەریکە زاراوەی (زێڕی سپی)ببێتەوشە یەکی لەباروشیاوبۆئاوی خواردنەوە))٠**

## ئافرەت و پاکوخاوێنی :

خاوێنی ماڵ ، کەسانی ناوماڵ و دەرەوەی ماڵ لەخزم و کەس وکارسەیری دەکەن ، لەوخاو ێنییەش ئافرەت واتا کابانی ماڵ بەرپرسە٠ئەگەرماڵ ناڕێك وشێواو بوو ، هەرقاپ و کەره سەیەك کەوتبووە جێیەك هەموو ئەندامانی ماڵ لێی بەرپرسن ، بەڵام زیاتر ئافرەت٠(ش) دەڵێ : ((بەرنامەی ڕۆژانە هەلگرتنی نوین گەسك لێدان ، چێشت لێنان ، خاوێنکردنەوەی قاپ و قاچاخ ، سڕینەوەی کاشی ، ٠٠٠تاد٠دەبێ هەموو ڕۆژێك ئەنجام بدرێ٠ لەبەرنامەی مانگانەش دەبێ کابانی ماڵ هەندێك خۆی ماندووبکات و بەردەرگای بشوات و سەرلەنوێ دیکۆری هەندێك کەل و پەل بگۆڕێ وەك مەتبەخ و هۆڵی پێشوازی (دیوەخان)٠وەهەموو ڕۆژێك تۆزی نیشتووی کەل و پەلەکانی بسڕێتەوە و ناوماڵەکەی بەکەل و پەلی زۆرو وردە واڵە قەرەباڵەغ نەکات٠کەل و پەلی زیادە لەمەخزەنی ماڵ یان ژوورێکی تایبەت دابنێ یان بیانفرۆشێتەوە))٠

## ئافرەت و كاركردن :

ئیشكردن پیرۆزەو پەیوەندی بەژیانی مرۆڤەوە هەیە٠مرۆڤ ئەگەرئیش نەكات زووپەكی د
ەكەویٚ و بیرلەتەنیایی خۆی دەكاتەوە تەنانەت ئەگەركەسیٚك خانە نشین كرابیٚ دەبیٚ خۆ
ی بەئیشیٚك خەریك بكات بۆنموونە ئافرەتی پیر ئەگەر هیچ ئیشیٚك نەبوو بیكات بەلایە
نی كەمەوە خۆی بەباخچەی ماڵەوە خەریك بكات وخوی بداتیٚ یان خەریكی خویٚندنەوە
بیٚت یان نووسین یان هەرئیشیٚك زەوقی لیٚ بیٚت٠بۆنموونە ئەگەروەختی خۆی مامۆستابو
وە دەتوانیٚ بەوانە بیٚژی دەرس بلیٚتەوە٠

(م) دەڵیٚ : ((كریٚكارهەرئەوەنییە لەبواری بیناسازی كاربكات ودەست بداتە قازمەوخاكەنا
س وعەرەبانە ، بەلكوئەوانەش كەلەكارگەوكۆمپانیاكان كاردەكەن تەنانەت ئەوانەش لەبە
رامبەر مووچەیەكداوەك كارمەندیٚكی ئیداری كاردەكەن هەركریٚكارن٠زۆربەداخەوە كریٚكا
رانی كەرتی تایبەت لەمووچەی خانەنشینی ودەستەبەری كۆمەلأیەتی بیٚبەشن))٠

(س) دەڵیٚ : ((زۆرجاركەباسی كریٚكاردەكریٚت تەنیاپیاوانی كریٚكارمەبەستیانە ، بەلأم لە
كۆمەلگەی ئیٚمەش ئافرەتی كریٚكارزۆرن لەبواری جۆراوجۆركاردەكەن وەك كارگەی بەرهە
میٚنانی شیرنەمەنی وترشیات یان كارگەی دروومان ، زۆربەشیان ڕۆڵی سەرپەرشتی خیٚزان
دەبینن یان هاوسەریان نەخۆش وپەككەوتەیە توانای كاركردنیان نییە یان كۆچی دوایی كر
دووە))٠

(س) دەڵیٚ : ((زۆرجاركەباسی كریٚكاردەكریٚ تەنیا پیاوانی كریٚكارمەبەستیانە ، بەلأم لە
كۆمەلگەی ئیٚمەش ئافرەتی كریٚكارزۆرن لەبواری جۆراوجۆركاردەكەن وەك : كارگەی بەر
هەمهیٚنانی شیرنەمەنی و ترشیات یان كارگەی دروومانی جل وبەرگ زۆربەشیان ڕۆڵی سە
رپەرشتی خیٚزان دەبینن یان هاوسەریان نەخۆش و پەككەوتەیە توانای كاركردنیان نییە
یان كۆچی دوایی كردووە٠

(ت) ئافرەتیٚكی پاریٚزەرە دەڵیٚ : ((بزانم یەكیٚك بەڕاستی تاوانبارە پارەشم بدەنیٚ بەرگری
لیٚ ناكەم ، هەروەها ناخۆشترین كاتم دۆڕاندنی كاریٚكە))٠

(ل)یش ئافرەتیٚكی پاریٚزەرە دەڵیٚ : ((ئەوكارانەی دیٚنەلامان مەسەلەی كەسایەتی زۆرترە و
ەك تەلاق و میرات و ئەوجۆرە شتانە ، هەروەها سیفەتی پاریٚزەر ڕاستگۆیی و بەرگری كرد

نه لەمافی ڕەواو گوێنەدانه بەپارە))٠
(ح) یش ئافرەتێکی پارێزەرە دەڵێ : (( مەرج نییه پارێزەر لەهەموو کارێکی دا سەرکەوێت گرینگ کۆڵنەدانە٠حەزلەکاروباری ئافرەتان دەکەم ، چونکە زیاترلێیان تێدەگەم))٠
(ن) یش ئافرەتێکی پارێزەرە دەڵێ : (( هەرکارێکم بۆبهێنن سەرەتا بیرێکی لێ دەکەمەوە ئەگەرمافی ڕەوای هەبوو وەری دەگرم ئەگەروانەبوو وەری ناگرم))٠
(ش) لەدایەنگەی ئەهلی کاردەکات ، دەڵێ : ((ئەوکارەم لاپیرۆزە ، هەست بەدایکایەتی دەکەم ، بەتەمەنی منداڵی باوکم بەمێردی دام تەمەنی مێردەکەم نزیکەی شەست ساڵ دەبوو زۆر بەتەمەن لەمن گەورەتربوو هێشتامن تەمەنم مابووی بۆسی ساڵ مێردەکەم بەهۆی پیری و نەخۆشی کۆچی دوایی کرد ، کەلەدووژنی دیکەی منداڵی هەبوو تەنیامولکی ئەویش خانوو یك بوو کوڕەکانی فرۆشتیان کەسیشیان لەمنی نەپرسییەوە ، چەند ساڵ لەماڵی برام بووم ئەویش کەمئەندام بوو توانای کارکردنی نەبوو ، منیش هەندێ زێڕوزیووم هەبوو بۆم فرۆ شتن ، کەپارەم نەما ناچاربووم بەنان کردن بۆماڵان و خاوێنکردنەوەی ماڵی خەڵك٠

**ئافرەت وخواردن :**

**خواردن سەرچاوەیەکی گرینگی وزەیە هۆکاری بەردەوام بوونی ژیانیەتی بۆیە ئادەمیزاد زۆربایەخی بەخواردن داوە بەتایبەتی زۆربەمان کەلەدەرەوە کاردەکەین بەرلەوەی بگەڕێینەوە بۆماڵەوە جاری وایە تەلەفۆن دەکەین ئایا دەبێ چ خواردنێکمان هەبێ ؟**

کریم الشاذلی **لەکتێبەکەی دا : ((چەندێك لەژیان دەژیت ؟)) دەڵێ : ((لەژیانی هاوسەریمان دا پێویستمان بەتێپەڕاندن وخۆگێلکردن هەیە لەزۆرێك لەبابەتەکان دا وەکو : پێنەدانی نانی بەیانی بۆئەوەی ژیانمان ببەینەسەر))٠**

**(ڕ) دەڵێ : ((زۆرجارلەسەرئەوەی لەدەرەوە نان دەخۆم لەگەڵ خێزانەکەم بۆتە کێشەمان لەسەرئەوەی بۆچی لەماڵەوە نان ناخۆم ؟ خێزانەکەم پێم دەڵێ : ئەوهەموو مەسرەفەم بۆچی کردووە ؟ تۆش لەدەرەوە چینە مەسرەفێکی دیکە دەکەی))٠**

**(ش) ئافرەتێکە دەڵێ : ((من زۆرتوڕەدەبم کاتێك هاوسەرەکەم لەدەرەوە نان دەخوات ، نانی دەستی من ناخوات ، چونکە زەرەری ماددیش لەماڵەوە دەدەن))٠**

**(پ)دەڵێ :((ئەمرۆخەلکێکی زۆرحەزدەکات لەدەرەوە نان بخوات بەتایبەتی ئەوانەی کاسبکارن کەمتردەرفەتیان دەبێت بچنەوە ماڵەوە٠هی واش هەیە لەبەرتام و لەزەتی خواردنەکان لەچێشتخانە نان دەخوات ، چونکە هەموومرۆڤێك حەزبەخواردنی خۆش و بەلەزەت دەکات))٠**

ئافرەت و پۆشتەیی :

تەبەرروج واتا دەرخستنی جوانی بۆهەمووکەسێکی نامەحرەم٠خوای گەورە دەفەرموێ :
{ولاتبرجن تبرج الجاهلية الأولى} الأحزاب

واتا : کاتێك چوونە دەرەوە خۆتان مەڕازێننەوە وەك بورجێك خۆتان دەرمەخەن وەك چۆ ن بورج لەدوورەوە دیارە خەڵك سەرنجی دەدەن وامەکەن ، خۆتان مەڕازێننەوە خەڵکی بۆتا ن بڕوانن وەك چۆن ئەوانەی لەجاهیلیەتی پێشوودا دەچوونە دەرەوە خۆیان دەڕازاندەوە٠ ئافرەت دەبێ جگە لەهاوسەرەکەی جوانییەکەی بۆ هیچ کەسێکی ترنەخاتە ڕوو٠ هەروەها پێویستە ئافرەت بەتەنیا لەماڵ نەچێتە دەرەوە ئەگەربۆدابینکردنی پێداویستییەکانی چوو ەدەرەوە پێویستە کەسێکی مەحرەمی لەگەڵدابێ ئەگەرنەبوو دەستەخوشکێکی چاك وژیری لەگەڵدابێ ، هەروەها پێویستە ڕوخسەت لەباوك وگەورەی ماڵ وەربگرێ هەروەها لەکاتی پا رەپێدان بەفرۆشیاردەستی نەدات لەدەستی فرۆشیارەکە وەزۆرلەگەڵ فرۆشیارەکە نەدوێ وز ەردەخەنە نەهێنێتە سەرلێوی٠هەروەها لەکاتی کڕینی زێڕوبازن و ئەموستیلە با فرۆشیارە کە نەیکاتە دەستت٠

عەلی وەردی لەبارەی گێچەڵ کردن بەئافرەت دەڵێ : ((ئەودیاردەیە لەڕابردوودا وەك ئێستا پیاونەی دەتوانی گێچەڵ بەئافرەت بکات ، ئەوکات لەشارەکان دا ئافرەت بالاپۆش بوو ، دوا ی ئەوەی خۆڕازاندنەوە لەناوژنانی شاردا دەرکەوت ئەوهەلە (فرسەت) بۆپیاوان هاتە پێشە وە گێچەڵ بەئافرەت بکەن))٠

ئیمامی عەلی (خوالێی ڕازی بێ) وتوویەتی : ((عقول النساء في جمالهن وجمال الرجال في عقولهن))٠

واتا : ((هۆشی ژنان لەجوانییان دایە ، جوانی پیاوانیش لەهۆشیان دایە))٠ چونکە ژن بیرو مێشکی هەرلەلای لەبەرکردنی جل وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ وزێڕوخشل لەبەرکردنە٠

یەکێك لەداوەکانی شەیتان بریتییە لەئافرەت٠وتراوە شەیتان بەژنی وتووە: تۆنیوەی سوپا کەمی، تۆئەوتیرەمی کەدەیهاوێژم وئامانجی پێ دەپێکم٠

لەیۆنانی کۆن ولەناوعەرەبی پێش ئیسلامدا ئافرەتی کۆیلە ڕووت بوون ، ئافرەتی ئازاد بەرگ وپۆشاکیان لەبەردابوو واتا حیجاب ناسنامەی ئافرەتی ئازاد بوو بۆئەوەی بناسرێنە وە ولێکجیابکرێنەوە واتا ڕووت وقوتی سیمبولی کۆیلایەتی بوو٠

**جاری واهەیە ئافرەت مکیاژێکی زۆری کردووە دەست نوێژناگرێت وگوێ بەنوێژەکەی نادات دەڵێ نەبادا مکیاژەکەم لێ ببێتەوە ونوێژەکەی دەچوێنێ :** {٠٠٠أضاعوا الصلوة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غيا} مريم : ٥٩

**پیشەی پیاوانی ئاینی بریتییە لەئامۆژگاری و قسەی نەرم ، وتاربێژی یەکێك لەمزگەوتەکا نی سعودیە دەڵێت : (( من لەسەرەتای سالآنی وتاربێژی دابووم ، ئەوەندە توندبووم لەسەر مینبەری وتاربێژی دا وتم : ئەوەی مۆڵەت بدات بەژنەکەی یان کچەکەی یان خوشکەکەی ، کەلەتەنیشتی دانیشتووە لەناوئۆتۆمبێل دا نیقابەکەی لابدات و ڕوخساری دەربخات ئەوا ئە وکەسە دەییوسە! بەلأم من ئێستا دەزانم ، کەئەوکات هەڵەبووم))٠**

**پشتگیری لەوقسەیە دەکەم ، کەدەڵێ : نابێ پیاو لەسەر ئەو کورسییەی ئافرەت لەسەری دا نیشتووە لەناوپاص دابنیشێ ، کەئافرەت لەسەری دانیشتووە تەنها دوای ماوەیەك نەبێ، چو نکە کەم یان زۆرشەهوەت دەجووڵێ نابێ لەچەند خولەکێك کەمتربێ (نوسەر)٠**

**ئەمڕۆهەرئافرەتێك بەتەنیا سەرپۆش بکات بەحیجاب دادەنرێ ئەمە تێگەیشتنێکی هەڵەیە ئافرەتی واهەیە سەرپۆش دەپۆشێت و شوێنەکانی تری دەردەخات لەگەڵ هەندێك قژی٠**

## ستەمی كۆمەڵایەتی :

ئەوستەمەی لەنێوان مرۆڤەكان دا ڕوودەدات شێوەی جۆراوجۆری هەیە ، ئەوتاوانانەی كە مرۆڤ كردوویەتی ئەگەرپەیوەندی بەمافی خەڵكی یەوە هەبوو وەك خواردنی ماڵ ئەوە د ەبێ بیداتەوە بەخاوەنەكەی ، بەلاّم ئەگەرئەوتاوانە پەیوەندی بەژنانەوە هەبوو ناگونجێ داوای لێبوردن لەبرای ژنەكە بكات، چونكە لەوانەیە ئاژاوەی لێ پەیدا ببێ بۆیە تەنیا نیا زی وازهێنان وتەوبەكردن بەسە بۆئەم تاوانە٠

**سیفەتەکانی نەفامی :**

چەرخی پێش ئیسلام ناودەبرێ بەجاهیلی ، زانست دژوپێچەوانەی (جەهل)ە ، مەبەستیش لەزانست زانستی فیقهە٠بەڕای من چەمکی جاهیلیەت تەنیا تایبەت نییە بەژیانی عەرەبی پێش ئیسلام ، بەڵکو ئێستا بەرگێکی نوێی کردۆتە بەر بۆنموونە پۆشاکی شەرعی فڕێدراوە پۆشاکی ئێستا لەسەرهەواوئارەزوو هەڵچنراوە٠

١ – بڕوابوون بەبورج وکاریگەرییان لەسەرڕووداوەکان :

قەومی نەمروود بتیان دەپەرست لەسەر شێوەی ئەستێرەکان کێشابوویان و دەیان پەرست ، چونکە باوەڕیان وابوو ئەستێرەکان کاریگەرییان لەسەرڕووداوەکان هەیە بۆیە بتیان درو ست دەکرد لەسەرشێوەی ئەستێرەکان و دەیان پەرست٠هەروەکو ئێستا لەزۆرێك لەڕۆژنامە وگۆڤارەکان بلاْودەکرێتەوە بەناوی بورجەکان٠

(م) ئافرەتێکە دەڵێ : (( مێردەکەم زۆربڕوای بەبورجەکەی خۆی هەبوو ، کەبورجەکەی (تەرازوو)بوو٠ئەوکابرایە ڕۆژانەوحەفتانەڕۆژنامەوگۆڤارەکانی دەکڕی تاکوبزانێ کەلووەکە ی چی پێدەڵێ ، ئەگەرجارێك لەبورجەکەی پێی بوترابایە کەئەوحەفتەیە زەرەردەکەی لە ترسان لەماڵەوە نەدەچووە دەرەوە ، مێردەکەم زۆرقەناعەتی بەکەلووەکەی خۆی هەبوو تا منی بەوهۆیەوە تەلاق دا٠ڕۆژێکیان مێردەکەم کەلووەکەی خۆی دەخوێنێتەوە کەتیایدا نو سراوە : پێویستە زۆربەوریاییەوە مامەڵە لەگەڵ دەورووبەرەکەت بکەی لەوانەیە یەکێك لە کەسەزۆرنزیکەکانت خیانەتت لێ بکات٠بۆیە ئەوپیاوە بوو بوو بەئاگر تاوای لێهات نەی دە هێشت بچمەوە ماڵی باوکم دەیووت : متمانەم بەتۆ نییە ، سەداسەد دەزانم کەتۆی دەتەوێ خیانەتم لێ بکەی٠تا وای لێهات ژیانم بوو بوو بەدۆزەخ ٠٠٠))٠

**٢– سزادانی خەڵکی بێتاوان بەهۆی تاوانی نزیکەکانی :**

**دوژمنداری دیاردەیەکە لەنێوان دوو بنەماڵە سەرهەڵدەدات ئینجا لەسەر ئافرەت بێت یان شەڕە سەگ یان لەسەر پاوان ولەوەڕگا بێت یان لەئەنجامی دەمەقالێی نێوان دووکەس بێ٠ بێگومان لەکۆمەڵگەی خێلەکی خەڵکێکی بێگوناه لەناودەچێت وخوێنێکی زۆردەڕژێت لە جیاتی ئەوەی کێشەکە بەڕێگای یاساو شەریعەت چارەسەربکەن٠**

**بێگومان هیچ کەس بەرپرسیارنییە لەتاوانی کەسێکی تربەمەرجێ دەستی لەوتاوانە نەبوو بێ وبەشدارنەبووبێ لەگەڵ کەسی تاوانبار٠خوای گەورە فەرموویەتی :** {ولاتزروازرة وزر أخرى} الأنعام : ١٦٤

**واتا : (کەس گوناهی کەسێکی ترهەڵناگرێ)٠ گەورەترین ستەم بریتییە لەوەی ، کەخەڵکی بێتاوان سزا بدرێت لەسەرتاوانی کەسێکی ترکەبێئاگایە لەوتاوانە٠بوونی ئەم جۆرە بیروبا وەڕە خێلەکییەش لەگەڵ دەقی قورئانی پیرۆزدژە٠کەواتە نابێت باوك بەهۆکاری تاوانی کو ڕەکەیەوە یان براکەیەوە یان خزمێکییەوە بکوژرێت٠**

**٣– هاواربردن بۆپیاوچاکان و داواکردن و پاڕانەوە لەمردووەکان :**

**ئەگەرتۆبچیت بۆلای کاربەدەستێك دەبینین سکرتێری داناوە لەبەربێ توانایی دایناوە، چو نکە ئەگەرچەند کەسێك بەیەکەوە داواکارییەکانی خۆیان بخەنە بەردەستی ناتوانێ بە یە کەوە تێیان بگات و جێ بەجێیان بکات ، بەلاّم خوای گەورە بەراورد ناکرێ بەمرۆڤ دەتوا نێ لەیەك کاتدا وەلاّمی هەموو بەندەکانی بداتەوە٠**

{فلا تدعوا مع الله أحدا} الجن : ١٨

**واتا : (لەگەڵ خودا هاواربۆکەسی ترمەبەن)٠نزاوپاڕانەوە کرۆکی پەرستنە ، ئەوفەرموودە یە :** ((العاء مخ العبادة))٠

**وێڕای پێشکەوتنی ژیان و هۆشیاری خەڵك هێشتا خەڵکانێك دەچنە سەر مەزاروگۆڕی پیاو چاکان و لەسەرگۆڕەکانیان بەرێگای شێخەکە یان پیاوچاکەکە دەپاڕێنەوە و هەندێ خەڵك لەسەرگۆڕەکە نوێژدەکەن و هەندێك بەردوخۆڵی سەرگۆڕەکە بەلەشی خۆیان دادەینن، هە ندێکیشیان پارچە پەڕۆیەکی سەوزلەسەرکێلەکە دەکەنەوە لەشوێنێکی جەستەی خۆیان دە بەستن یاخود دەیخەنە ناو پەرداخێك ئاو بەمەبەستی شیفا دەخۆنەوە ، بەزۆریش ئافرەت ڕوودەکەنە ئەوشوێنانە٠**

**(ع) دەڵێ : ((من هاتووم تاکولەرێگای ئەم چاکەوە ، خوا منداڵێکم پێ بدات))٠**

**(ش) دەڵێ : ((من نەخۆشم سەردانی دەیان دکتۆرم کردووە چارەسەرم بۆنەکراوە ، هاتوو مە سەر ئەوچاکە دەڵێم بەڵکو خوا شیفام بۆبنێرێت))٠**

**٤– ئاژەڵ سەربڕین بەمەبەستی گەورە ڕاگرتنی ئەو کەسەی ئاژەڵەکەی بۆسەر دەبڕێ :**
**خوای گەورە دەفەرموێ :** {فصل لربك وانحر} الكوثر : ٢
**واتا : (نوێژبۆخوابکەوحەیوان بۆئەوسەربڕە)٠**
**حەیوان سەربڕین چەند جۆرێکی هەیە :**
**یەکەم : بەمەبەستی گەورە ڕاگرتنی ئەوکەسەی حەیوانەکەی بۆسەر دەبڕی و خۆت بە بچووکتر لەئەودەزانی مەبەست لەوکارەش نزیکبوونەوەیە لەوکەسەو ئەم جۆرەشیان تە نیادەبێ بۆخوای گەورەبێ وئەنجامدانی بۆجگە لەخوای گەورە هاوبەشدانانە ، خوای گە ورە دەفەرموێ :** {قل ان صلاتي ونسكي ومحياي ومماتي لله رب العالمين (١٦٢) لاشريك له وبذلك أمرت وأنا أول المسلمين (١٦٣) الأنعام٠
**واتا : (بڵێ ئەونوێژانەی دەیکەم و ئەوی سەری دەبڕم لەوحەیوانانەی کەفەرمانم پێکراوە ئەوەی لەژیانم دا دەیکەم و ئەوەی بەسەرم دادێت و ئەوەی لەسەرم نوسراوە لەمردنم دا هەمووی بۆخوایەو هی ئەوە ، ئەوخوایە هیچ شەریك و هاوەڵێکی نییە ، وەتەنها بەوەش فەرمانم پێکراوە ، وەمن یەکەم کەسم کەئەنجامیان بدەم)٠**
**دووەم : سەربڕین بەمەبەستی ڕێزلێنان لەمیوان یان بۆشایی و بووك گواستنەوەوبۆنەکانی دیکە٠**((٠٠٠ومن كان يؤمن بالله واليوم الأخرفليكرم ضيفه)) رواه البخاري ومسلم٠
**واتا : ((٠٠٠هەرکەسێ بڕوای بەخواوبەڕۆژی دوایی هەیە باڕێزی میوانەکەی بگرێت))٠**
**هەروەها ئەوفەرموودەیە :** ((أولم ولو بشاة)) رواه البخاري ومسلم٠ **کاتێك عەبدولرە حمانی کوڕی عەوف ژنی هێنا ، دروودی خوای لەسەربێ پێی فەرموو : ((دەعوەتی شایی بکە ئەگەر بەمەڕێکیش بێ))٠**

**بەهار :**

**بەهار ، بوار ، بوهار ، وەهار ، ڤەهار هەموویان یەك واتایان هەیە٠بەهاریەکەم ڕۆژی ساڵی کوردییە ، سەرماوسۆڵە نامینێ و گژوگیا پێدەگات بەتایبەتی ئەوگیایانەی دەخورێ٠لە (١) ی مانگی نەورۆزەوە دەستپێدەکات و (٣) مانگ دەخایەنێت ، بەلاٚم لەناوچەی گەرمیان زۆر کورتە ، بەلاٚم بەهاری ناوچەی کوێستان درەنگتردێت لەبەهاری ناوچەی گەرمیان وەهەروە هازۆربەدرەنگیش کۆتایی دێت٠دەتوانین بڵێین ناوچەی کوێستان هاوینی کەمە وکاتی بەها ری زۆرە٠بەهاربەمەجازیش بەکاردێ دەوترێ :(بەهاری تەمەن) واتا : (جوانی و جاعێلی)٠ بێگومان گەلی کورد لەوەرزی بەهار بەتایبەتی لەڕۆژی نەورۆز کەدەکاتە (٣/٢١) بەگەورەو بچووکەوە بەرەو سەیرانگاکان بەڕێدەکەون تا چێژلەجوانی سروشت وەرگرن بەخۆشی و شادی لەوێدا کاتەکانیان بەسەرببەن٠نەورۆز دوو واتا دەبەخشێت یەکەمیان : سەرکەوتن بەسەر زوڵم و زۆرداری٠دووەمیان : گۆڕانی ئاووهەوا لەبارێکی ناخۆش کەساردوسڕە بۆبار ێکی تر کەهەوا خۆشە٠**

**لەنەورۆزدا هەزاران ئۆتۆمبێل بەدوای یەکدا ڕێچکە دەبەستن بەرەو سەیرانگاو هاوینە هە وارە خۆشەکان بەشاخ و دەشت ودەرەکان دا دەڕۆن وەك : دڵۆپە و شێرەسوار و تەوسکەو زو رکڤان و٠٠٠هتد٠ بۆیە پێویستە هەمووخەڵك بەیەکەوە نەچنە دەرەوە ، چونکە لەئەنجامی ئەوقەرەباڵەغی و حەشاماتەدا ژمارەیەکی زۆر ڕووداوی هاتووچۆ ڕوودەدات٠**

**ئیدیۆمی کوردی :**

مامۆستا عەزیزگەردی لەپێناسەی ئیدیۆم دا دەڵێت : ((ئیدیۆم ئەوەیە وشەیەك یان دەستە وشەیەك بێنیت ، کەوتایەکی دروستی خۆی هەبێت هەرلەوکاتەدا لەڕستەکەدا مانایەکی تر بدات بەدەستەوەومەبەست ئەم مانایەی دوایی بێت ، دیسان دەشێت واتادروست و نەژادییە کەت مەبەست بێ))٠

هەزار : بۆژمارە زۆرییە بۆنموونە لەشوێنێك کۆمەڵێکی زۆرخەڵك هەیە دەڵێن هەزارکەسی لێ بوو ، دەیەوێت بڵێت زۆرن وشەی هەزاربەکاردەبا٠

پێنج و دوو : ماوەیەکی کەم٠بۆنموونە دەوترێ : دنیاپێنج ودوورۆژێکە٠

دەستەویەخە : لێکدان٠دووکەس بەشەڕدێن دەستیان لەبەرۆکی یەکترناوە ئەوەندەی توانیا ن لەیەکتریان داوە٠

ئاوی لێ ناخواتەوە : مەبەست ئەوەیە کەبەزووترین کات ئامادەیە کارەکەی جێ بەجێ بکات یان بچێتەسەری٠

ئاووئاوەدانی : مەبەست ئەوەیە لەکوێ ئاوهەبێ ، ئاوەدانیش دەبێ ، یان جێگایەك ئاوەدان بێ بێ ئاونابێ٠

دەست و برد : چالاك ، گورج و گۆڵ لەکارکردندا٠

پاشاگەردانی : شیرازەی یاسا تێکچووە هەرکەس بۆخۆیەتی٠

داردەست : پیاوی ئەم و ئەوە بەدەسیانەوە خراپەی پێدەکەن٠

دەمڕاست : گەورەی شوێنێ بێ قسەی بکاو خەڵك بەگوێی بکەن ، دەمپاراووقسەزان بێ با یەخی قسەکانی زۆربێ گوێگر باوەڕی پێ بهێنێ٠

دەمودەست : واتا زۆربەپەلە ، یەکسەربێ وەستان٠

دەم ولووتی بەیەکداداوە : مەبەست لەپەستییە وەرس بوونە٠

دەم پیسە : بەیەکێ جنێوفرۆش دەوترێ٠

دەمی چەورکرد : بەرتیلی پێدا بێ دەنگی کرد٠

دڵسافە : بەیەکێ دەوترێ کە عادزبوون و توڕەبوونی زۆردرێژەنەکێشێ ، زۆر زوو لەبیری بچێتەوە٠

دڵتەڕە : بەیەکێ دەوترێ ، کەحەزی بەلەبەرکردنی جل و بەرگی جوان بێ تەمەنی گەورە ش بێ یان حەزی بەقسەی خۆش و گاڵتەوگەپە.

دڵفراوانە : بەیەکێ دەوترێ کەبەخشندەولێبوردەبێ ، هێمن بێ و تووڕەبوونی کەم بێ.

دلگرانە : بەیەکێ دەوترێ ، کەبەهۆی کردەوەیەکەوە یان وتەیەکەوە عادزبووبێ.

دڵ لەدڵ مەدە : مەبەست دڵنیابوونە.

دڵمردووە : مەبەست لەیەکێکە بەتەنگ جوانی و ڕازاندنەوە نەبێ و گوێ بەجل و بەرگ و پۆشاك نەدات و دنیای بەگرینگ نەگرتبێ.

دڵی ئاوی خواردەوە : مەبەست لەیەکێکە ، کەچاوەڕوانی کارێ یان هەواڵێ دەکات کەزۆربە تەنگ جێ بەجێ بوونیەوەتی هەواڵەکە جێ بەجێ بوو ئیسراحەتی کرد و دڵنیابوو.

دڵی دایەوە : مەبەست لەدڵنەوایی کردنە ، هێنایەوە سەرخۆی.

دڵی ڕادەگرێ : مەبەست لەوەیە دڵی ناشکێنێ و دڵخۆشی دەکات و نایەڵێ زویربێ.

دڵی شکاند : زویری کرد.

دڵی شەقی برد : بەیەکێ دەوترێ خەفەتێکی زۆری هەبێ.

دڵی کرایەوە : خۆشی تێکەوت.

دڵی گیراوە : بەیەکێ دەوترێ ، کەبەهۆی خەم و خەفەتەوە خواردنی پێنەخورێ.

بەدوای کلاوی بابردوو کەوتووە : بەیەکێ دەوترێ ، کەکەوتبێتە دوای کارێك کەهەرگیزبۆ ی نابێ.

دووگیانە : سکپڕە.

دوورناسە : بەیەکێ دەوترێ کەزۆرشارەزای خەڵك بێ بەسەرهاتی دنیای زۆردیبێ وباش و خراپ لێکجیابکاتەوە.

دوژمن بەشەکردەخنکێنێ : مەبەست لەوکەسەیە کەزمان شیرین و قسەخۆشە و دانایە کە بەسەردوژمندا بەقسەی خۆش زاڵ دەبێ.

دۆست ودوژمنی خۆی لێکجیاناکاتەوە : بەیەکێکی نەزان دەوترێ کەهێشتا لەدنیانەگەیشتو وە نازانێ کێ بۆی باشەوکێ بۆی خراپە ، کێ دۆستییەتی و کێ دوژمنیەتی زوودەخەڵەتێ.

ڕێی تێناچێ : مەبەست لەوەیە کەباسی شتێ ، ڕووداوێ ، قسەیێ ، کردەوەیەك دەکرێ عە

**قل نایگرێتەخۆی یان قبولی ناکات٠**

**ڕاست و چەپی خۆی ناناسێ : مەبەست لەیەکێکە کەهێشتا نەی توانیوە شارەزای ژیان بێ یان گێل و نەزانە٠**

**ڕەزا قورسە : بەیەکێ دەوترێ لەوانەیە ناشیرین نەبێ ، بەلاّم بەهۆی هەڵسوکەوتی ناڕەوای ئێسکی قورس دەبێ٠**

**ڕەشبگیری : مەبەست لەگرتنە بەبێ جیاوازی لەنێوان گەورەوبچووك و پیروگەنج و چاك و خراپ٠**

**ڕەش و ڕووتە : واتاهەژارودەستکورتە ، لەبەرکەمخۆراکی و نەبوونی دەم و چاوی ڕەش هە لگەڕاوە٠**

**ڕەق و تەقە : بەیەکێ دەوترێ کەزۆرلاوازبێ و گۆشت بەلەشییەوەنەبێ٠**

**ڕێوی یە : مەبەست لەیەکێکی زۆرفێڵبازە٠**

**ڕووڕەش : بەیەکێك دەوترێ کەتاوانبارب‌ێ ، خراپەکاروبەدخوو و ڕەوشتی خراپ بێ٠**

**ڕووزەرد : بەیەکێکی خەتابارو شەرمەزاردەوترێ٠**

**ڕووسپی : بەئافرەت دەوترێ کەخوڕەوشتی جوان بێ و خاوەن کرداری باش بێ٠**

**ڕووسوور : بەئافرەت دەوترێ کەسەربەرزبێ و کەم و کوڕی نەبێ٠**

**ڕووی دایێ : بەڕێزەوە پێشوازی کرد٠**

**ڕووی لێ وەرگێڕا : مەبەست لەیەکێکە پشت لەدۆستەکەی یان ناسیاوەکەی وەرگێڕێ یان پشتی تێ بکا یان ببێ بەناحەزی٠**

**ڕووتایەوە : مەبەست لەیەکێکە کەخاوەن سامان بووە ، بەلاّم ئێستا هیچی بەدەستەوە نەما وە٠**

**ڕووت و ڕەجال : مەبەست لەیەکێکە کەزۆر هەژاربێ٠**

**ڕووحیان بەسەرسەری یەکەوەیە : مەبەست لەدووکەسە کەناتوانن بەبێ یەکترهەرگیزبژ ین ، یەکتریان زۆرخۆش دەوێ٠**

**ڕوون بۆوە : شتەکە ئاشکرابوو ، دەرکەوت٠**

**ڕیسەکە بوویەوە خوری : مەبەست لەوەیە کەکارەکەی هەڵوەشاوە٠**

ڕێك و پێكه : واتاڕەوشتی بەرزە٠
زمانی بەسترایە : بەیەکێ دەوترێ کەنەتوانێ مەبەست دەربڕێ نەوێرێ یان شەرم بکات٠
زمان شیرین : قسەخۆشە و زۆربەڕێزەوە قسەلەگەڵ خەڵکی دەکات٠
زمانی لەدەم دانییە : بەیەکێ دەوترێ کەم دووبێ و حەزی لەقسەی زۆرنەبێ یان قسەنەزا نێ لەبەرکەمدوویی یان لەبەرهۆی دەروونی خۆی٠
سەرگەردانە : ماڵوێران و بێ خانەولانەیە یان بەهۆی کارەساتەوە تەواوپەریشان بووە٠
سەرگەرمی : ئیشی زۆروسەرقالی٠
سەرودەرووی لێ دەرناکە : مەبەست لەیەکێکە لەکارێ یان ئیشێ هیچی لێ نازانێ٠
سەرهەلینەوخوای ببینە : بەیەکێ دەوترێ کەزوڵمێکی زۆرلەخەڵکی بکا ئەوجا ئەوگوتە یەی پێدەوترێ کەویژدانی هەبێ و خوای بناسێ٠
سەری پێوەنییە : مەبەست لەوەیە پیاوچاکە بۆپیاوەتی ئامادەی هەمووکارێکە بۆئێوە٠
سەری خۆی هەڵگرت : مەبەست لەبەجێهێشتنی جێگایە یان بەهۆی ئەوەی کەزوڵم وزۆری لێ دەکرێ ناتوانێ ڕووبەڕووی بوەستێ یان هەرهۆیەکی تر٠
سەری سووکە : ئەمە بەیەکێ دەوترێ دڵی ئیسراحەت و ئاسوودەبێ ئەرکی زۆری بەسەروە نییە٠
سەرێکی هەیەوهەزارسەودا : مەبەست لەوەیە کەهەمیشە سەری قاڵەو ئیش وکاری زۆرە٠
سەری نایەوە : مرد٠
سەری هێناوبرد : مەبەست بیرکردنەوەیە٠
سووك بووە : بەیەکێ دەوترێ کەکارێکی نارەوای کردبێ یان بەهۆی شتێکەوە خەڵك قسەی لێوەبکاو بەم هۆیەوە پلەوڕێزی کەم بێتەوە وەکوجاران قەدری نەمابێ٠
سێ و دووی لێ نەکرد:مەبەست لەوەیە کەیەکێ بێ لێکدانەوەودواخستن کارەکەی ئەنجامدا٠
شاری بێ حاکمە : مەبەست لەوەیە کەخەڵك بەرەللاَیەو کەس بەکەس نییە٠
شاری خامۆشان : مەبەست گۆڕستانە٠
شانبەشانی یەکتری دەڕۆن : مەبەست لەدووکەسە کەوەك یەك پێشکەون٠
شان لەشانی ئەودەدا : بەیەکێ دەوترێ خەریکە بگاتە ئەویتر لەدەوڵەمەندی یان پلەی ڕۆ

شنبیری دا٠

شەڕەدەنووك : بەشەڕەقسەی نێوان دووكەس دەوترێ٠

شەڕواڵ پیس : بەپیاوێ دەوترێ كەخەریكی كاری جنسی حەرام بێ٠

شل ومل : بەئافرەت دەوترێ كەنەرمە گۆشتی زۆربێ٠

شیری پاكە : مەبەست ئەوەیە كەجێگای بڕوایەو پاك و چاك و دڵسۆزە٠

قەرزوقۆڵە : مەبەست قەرزی زۆرە٠

قۆلیان لەبندا بڕیەوە : واتا شتێكیان پێ فرۆشتووە زۆربەگران ، خەڵەتاندوویانە٠

كاسە كەپڕبوو لێی دەڕژێ : واتا زوڵم وستەم ئەگەرزۆربوو بەرگەی ناگیرێ٠

كاسە لێسە : مەبەست لەیەكێكە ماستاوبۆخەڵك دەكات٠

كەڵەگایە : بەیەكێك دەوترێ زۆرلەخەڵك بكات و دەستدرێژی بكاتە سەرئەم و ئەو٠

كەڵەشێریش نەخوێنێ ڕۆژهەرئەبێتەوە : مەبەست لەوەیە ئەگەرئەویش ئەوەنەكا هەیە بیكا٠

كەوتۆتە قوڕەوە : مەبەست لەیەكێكە كەتووشی دەردی سەری هاتبێ یان لێی قەومابێ٠

كردی بە ئەموستیلەوكردییە پەنجەی : بەیەكێ دەوترێ كەبەهۆی نەرم ونیانی و ئارامی و قسەی شیرین بتوانێ ئەوكەسە بكابەدۆست وهاوكاری خۆی٠

كۆستی كەوتووە : بەیەكێ دەوترێ ، كەباوكی یان برای یان مامی یان خاڵی مردبێ٠

گەڕەلاوژێ : بەودەنگە ناسازانەی ناو شوێنێك دەوترێ كەكەس گوێی لەكەس نەگرتووە٠

گەردن كەچە : بەیەكێ دەوترێ كەهەژاروبێ دەسەلآت و باركەوتوو خەفەتباربێ ، بێ كە س و بێ پشتیوان بێ٠

گەرم بووە : مەبەست توڕەیە٠

گۆڕبەگۆڕبێ : بەیەكێ دەوترێ كەئەوەندە خراپ و نالەبارو زاڵم بێ كەمردووە گۆڕەكەی قولتربێ٠

گۆشتی پیسە : بەیەكێ دەوترێ كەزۆردرەنگ برین و زامی چاك بێتەوە٠

گولۆڵەی كەوتە لێژی : بەیەكێ دەوترێ كەحالی بەرەوخراپی ڕۆیشتبێ٠

لووتی بەرزە : خۆبەزلزانە٠

**لێوبەبارە : مەبەست لەیەکێکە خەفەتباربێ و کۆستی کەوتبێ٠**

**مامە خەمەیە : بەیەکێ دەوترێ کەبەهەمووشتێ خەفەت بخوات٠**

**مانگ دیارەوئەوەجەی بەئەموست نییە : مەبەست لەوەیە کەکارەکە دیارەو ئاشکرایە بۆیە پێویستی بەڕوونکردنەوەنییە٠**

**مل پانە : بەیەکێ دەوترێ کەسەرشۆڕبێ ، شەرمەزاربێ٠**

**نان و پیازی لەگەڵ نەخواردووە : مەبەست لەوەیە کەنایناسێت و دۆستایەتی لەگەڵ نییە٠**

**نینۆکی نییە سەری خۆی پێ بخورێنێ : بەیەکێ دەوترێ کەزۆرهەژاربێ٠**

**نەشیش بسووتێ نەکەباب : مەبەست لەوەیە هەردوولایەکە لەتای تەرازوودابن گونجان لە نێوان دوولادابێ لایەك بریندارنەکەی لایەك دڵخۆشکەی٠**

**نمەك حەرامە : واتا نانی کەسێکی خواردووە و خیانەتیشی لێ دەکات٠**

**نەدی و بدییە : بەیەکێ دەوترێ کەشتێکی هەبوو دایمەن هەرخەریکی بێ و نەزانێ چی لێ بکا٠**

**ماڵداری کەرە : بەئافرەتێ دەوترێ کەئیدارەی ماڵ باش بەڕێوە ببات هەرچی شتێ لەجێگا ی خۆی سەرفکات٠**

**یەخەی خۆی دادڕێ : ئەمەش بەومەبەستەدێ لەناڕەزایی دابێ لەبێ دەسەڵاتی دا یەخەی خۆی دادڕێ ، لەخەفەتباری و کەم دەسەڵاتی یەخەی خۆی دادڕێ٠**

**یەخەی گرت : چووبەگژی دا ، شەڕی پێ فرۆشت ، ڕێی پێ گرت٠**

**ئۆجاغ کوێر : مەبەست لەیەکێکە هیچ مندالی نەبێ٠**

**لەکەلی شەیتان نایەتە خوارەوە : بەیەکێکی کەللە ڕەق دەوترێ ، کەلەسەرشتێکی بێ نرخ خەریکە شەڕێ سازبدا٠**

**لەگوێی گادا نووستووە : بەیەکێ دەوترێ ، کەلەهەواڵێ یان کارێ یان سەرگوزشتەیەکی بە ناوبانگ بێ ئاگابێ٠**

**قوڕی بۆگرتەوە : مەبەست لەوەیە کەتووشی ماڵوێرانی و زیانێکی گەورەی کردووە، تووشی کارەساتێکی کردووە یان ماڵ و سەروەتی تیابردووە٠**

**بادانەوە : بریتییە لەپاشگەزبوونەوە لەقسەیەك لەکردەوەیەك٠**

بارکەوتوو : بریتییە لەیەکێك کەبەدبەختی ونەهاتی ڕووی تێ کردبێ ونوشوستی هێنابێ٠

بارگرانی کرد : خەرجێکی زۆری هاویشتە سەرشانی و کارو ئەرکێکی زۆری بەسەردادا٠

باری گرانە : ئەرکی زۆرەو زۆرماندوو دەبێت٠

باڵ شکان : تووشی بەدبەختی بوون و سەرنەکەوتن٠

بڕبڕەی پشت : پشتیوانێکی گەورەیە لەکاتی تەنگانە فریای دەکەوێت٠

بلقی سەرئاو : کەم خایەن و کەم بەهایە٠

بۆنی خوێنی لێ دێت : بەقسەیەك یان شوێنێك دەوترێ کەچاوەڕێی کوشتاروخوێنڕشتنی لێ بکرێت٠

بۆنی شیری خاوی لەدەمی دێت : بریتییە لەیەکێکی منداڵ و کەم ئەزموون٠

بەباچوو : بەفیڕۆ ڕۆیشت٠

بەتیرێك دوونیشان دەپێکێ : بەقسەیەك یان کردارێك دوو ئامانج دێنێتەدی٠

بەجەرگە : ئازایە٠

بەحەوت ئاو پاك نابێتەوە : بریتییە لەیەکێك کەزۆرناپاك و پیسە (پیسی مەعنەوی)٠

بەخۆی دا چۆوە : بریتییە لەیەکێك کەبیری هەڵسوکەوتی خۆی کردەوە هەڵەکانی خۆی ڕاستکردەوە٠

دەستی دەڕوات : دەسەڵاتی هەیە٠

بەدەست بەتاڵی گەڕایەوە : هیچی دەست نەکەوت٠

بەدەم و پلە : قسەزانە٠

بەرپای خۆی نابینێت : واتا کورت بینەو عاقیبەتی کاری لەبەرچاوناگرێت و نەزانە٠

بەرچاوتاریك بوون :  هیچ نەدیتن لەبەرتوڕەبوونێکی زۆر٠

بەرزدەفڕێت : بەبەشی کەم داناکەوێت٠

بەرزە فڕ : کەسێك کەبیرلەخەیاڵ و کاری گەورە دەکاتەوە٠

بەرچاوتێر : چاوبرسی نییە بەبەشی خۆی دادەکەوێت و نان بدەیەودەستی ئەم و ئەودەگر ێت٠

بەرچاوتەنگ : ڕەزیل٠

بەرگی فەقیری درا : بریتییە لەگەیشتنی سەرماوسۆڵەی زستان٠

بێ پەڕوباڵ : بێ هێزودەسەلأت٠

بێ پەرژین : بێ شەرم٠

نانی کەوتۆتە ڕۆن : بەسامان و خۆشی گەیشتووە٠

پڕبوون : توڕەبوونێکی زۆر٠

پشتی سەری چاوە : زۆرهۆشیارە٠

پشت شکان : بەلأی زۆرگەورە ، هێزودەسەلأتی نەما ، پشتیوانی نەما ، ژێرکەوت ، شکستی خوارد٠

پشتی لەزەوی دا : ناپاکی لەگەڵ دا کرد ، زیانێکی زۆری لێدا٠

پۆشتەوپەرداخ : بریتییە لەجل و بەرگێکی ڕێك و پێك٠

پەلوپۆی خست : واتا شپرەزەی کرد٠

پێوەبوون : بریتییە لەتووشبوونی شتی ناخۆش٠

تازەبەتازە : بریتییە لەتەمەڵی ، درەنگ بەخۆکەوتوو٠

تاڵی و شیرینی : خۆشی و ناخۆشی ژیان٠

تەڕو وشك بەیەکەوە دەسووتێنێ : واتا تاوانباروبێ تاوان بەیەکەوە گرفتاردەبن٠

تەخشان و پەخشانی کرد : بێ دەربەسانە بەم و بەوی بەخشی٠

تەماشای دەمی تۆدەکات : چاوەڕێی ڕازیبوونی تۆیە٠

تەنگ پێ هەڵچنین : گوشارهێنان بۆسەرکەسێ٠

تێکەڵی : بریتییە لەدۆستایەتی و خزمایەتی٠

جگەرسۆز : بریتییە لەیەکێ بەتەنگەوە بێ و دڵی پێت بسووتێ٠

جگەرسووتاو : بریتییە لەئافرەتێك منداڵی مردبێ٠

جگەرگۆشە : بریتییە لەڕۆڵە ، منداڵ٠

جمەی دێت : زۆرقەرەباڵەغە ، خەڵکێکی زۆری تێدایە٠

جێگە خۆشکردن : بریتییە لەنیازی مانەوەی یەکێك لەشوێنێك٠

چاڵ بۆهەڵکەندن : واتا پیلانی بۆدەگێڕێت٠

چاوت ڕۆشن : واتا دڵت شاد٠

چاونەترس : ئازا٠

چاوتێبڕین : تەماح ، نیازی داگیرکردن و دەستبەسەرداگرتن (غصب)٠

چاوی شۆڕە : شەرمەزارە٠

چاوی کردۆتە چوارچاو : واتا زۆربەوردی ئەڕوانێ٠

چاوی ناتروکێنێ : ناترسێ ، سڵ ناکاتەوە٠

چرای عومری کوژایەوە : مرد٠

چوارچاو : چاویلکەلەچاو٠

چۆك دادان : بەزی ، شکستی خوارد٠

چەرمەسەری : دەردوئازارو ڕەنجی زۆر٠

خاوەن قسەی خۆیەتی : ڕاستگۆیە٠

خۆبردنە پێشەوە: بریتییە لەخۆخۆشەویستکردن بەکردەوە یان وتنی شتێك بەدڵی یەکێ٠

خۆخوراندن : بریتییە لەخۆئامادەکردن بۆبەخشینی پارە٠

خۆی گێل کرد : بریتییە لەیەکێك کەبانگی بکەن ، پرسیاری لێ بکەن وەڵام نەداتەوە٠

خۆی بەکەس نادات : بریتییە لەیەکێك کەخۆی لەگشت کەسێك بەتواناتروجوانتروتەواوتر دەزانێت٠

خۆت فێرمەکە : واتاخوگرتن بەشتێك٠

خەونی پێوەدەبینێت : تامەزرۆیەتی ، ئاواتەخوازی ئەوشتەیە٠

دانی بەخۆداگرت : ئارامی گرت ، بەرگەی گرت٠

دانی پێدانا : پێی لێنا ، بەڕاستی زانی ، ئیعترافی کرد٠

دڵتەزێن : کارەسات و ڕووداوی ناخۆش٠

دڵبەر : بریتییە لەئافرەتێکی زۆرجوان کەدڵ بۆلای خۆی ڕابکێشێ٠

دڵرەق : بێ بەزەیی٠

دڵی پێوەیە : حەزدەکات٠

دوودڵ : بریتییە لەڕاڕابوون لەکردنی یان وتنی کارێك٠

**دۆودۆشاوی تێکەڵ کرد : بریتییە لەیەکێکی زۆرتوڕە ، کەهەرچی بەدەمی دا بێ بیڵێ٠**

**دووربینی : بریتییە لەتەماشاکردنی دواڕۆژی کارەکە٠**

**لەبن سەردابوون : داڕشتنی نەخشەوپیلان لە مێشکدا٠**

**دەردی کارییە : واتانەخۆشییەکەی هیوای ساغ بوونەوەی نیە٠**

**دەستبلاو : ماڵ بەفیڕۆدەر ، پاشەکەوت ناکات٠**

**دەست بەتاڵ : بێکار**

**دەست بەردار : کەسێك کەدەستی لەکارێك هەڵگرتبێ٠**

**دەست لەملکردن : ئاشتبوونەوە٠**

**دەست لێك بەردان : جیابوونەوەی ژن ومێرد٠**

**دەست : دەسەلات٠**

**دەستبەجێ : خێراکارێك کردن٠**

**دەستبڕ : فێڵباز ، خەڵەتێن٠**

**دەستەپاچە : یەکێکی بێ دەسەلات ، دەستەوسان٠**

**دەست پاکی : دزی نەکردن٠**

**دەست پانکردنەوە : سوالکردن ، دەرۆزەکردن٠**

**دەست ڕەنگین : ئافرەتێك بەدەستی خۆی پیشەی جوان بزانێ٠**

**دەستی خۆی وەشاند : هەڵی لەدەست نەداو کارەکەی خۆی جێ بەجێ کرد٠**

**دەستی دەستی پێدەکات : دەیخافڵێنێت٠**

**دەستی گرت : یارمەتی دا٠**

**دەستی لەگەڵ تێکەڵ کرد : بریتییە لەیەکێك کەلەژێرەوە بەناڕەوا لەگەڵ یەکێکی ترڕێك بکەوێت٠**

**دەستی لێ بشۆ : بەتەمای مەبە٠**

**دەمەتەقێ : قسەوگفتوگۆکردن٠**

**دەمکوتی کرد : واتالەقسەی خست و بێ دەنگی کرد٠**

**ڕێچکەی شکاند : بریتییە لەکردنی کارێك لەلایەن یەکێکەوە بۆئەوەی کەچاوی لێ بکرێ٠**

ڕوحی لەبەرنەمایە : زۆربێ هێزولاوازبووە.

ڕووشکێن : بریتییە لەکەسێك کەرۆرمرۆڤ تەریق بکاتەوە.

ڕووهاتن : شەرم نەکردن.

ڕێ گۆڕین : بریتییە لەوازهێنان لەبڕوای خۆی.

زاخاوی مێشك : بریتییە لەیەکێك کەشتێك بخوێنێتەوە ڕۆشنبیری خۆی فراوانتربکات.

زمان گەستن : بریتییە لەپەشیمان بوونەوە.

ژێرچەپۆك : بریتییە لەیەکێك لەژێردەستی زۆرداریێك دابێت.

ژێربالْ خستن : بریتییە لەدەست بەسەریەکێك داگرتن و پەنادانی.

سەرپێکەوەنان : بریتییە لەژیان بەیەکەوە بردنەسەر.

بێ سەروشوێن : واتانەخۆی دیارەونەشوێنەکەی دەزانرێت.

سەر : بریتییە لەتاقە ئاژەڵێك.

سەرەڕۆ : بریتییە لەیەکێکی یاخی.

سەرتیاچوون : بریتییە لەمردن لەپێناوی شتێکدا.

سەرپێچی دەکات : لەدەستورویاسالادەدات.

سەرهەڵدان : بریتییە لەپەیدابوونی شتێك.

سەری خۆی هەڵگرت : بریتییە لەڕۆیشتن و بەجێهێشتنی شوێنێك.

سەری خۆی دانا : بریتییە لەیەکێك کەلەڕێگەی شتێکدا بکوژرێت.

سەری لەڕێدایە : تاگیان لەلەشی دایە حازرە بۆفیداکاری و خزمەت کردن.

سەنگین : بریتییە لەمرۆڤی بەشەرم و ئاوەز (عەقل).

سێ بەرد : بریتییە لەسێ تەلاقی ژن.

شکان : بریتییە لەهاتنە خوارەوەی نرخی شت ، هەروەها بریتییە لەشکست و بەزین.

شوێن پێی ئەوی هەڵگرت : بریتییە لەیەکێك کەچاو لەیەکێکی تربکات وەك ئەوبکات و لاسایی ئەوبکاتەوە و کرداری ئەوهەڵبگرێت.

شەڕفرۆش : بریتییە لەیەکێك کەبیانووی زۆربگرێ بۆبەگژداچوونیان.

شەڕەپشیلە : بریتییە لەخەتی زۆرناخۆش و تێکەڵ و پێکەڵ.

**شەکرشکاندن : بریتییە لەقسەکردن.**

**شەکراوخواردنەوە : بریتییە لەکۆڕی ژن مارەکردن.**

**فس فس پاڵەوان : بریتییە لەیەکێك کەهیچی لەبارانەبێ وهەرخۆی هەڵبکێشێ.**

**کارلەکارترازا : کارەکە لەدەست دەرچوو.**

**کافرپێ موسوڵمان بوون : بریتییە لەیەکێك کەجێگای ڕەحم و بەزەیی بێت.**

**کای کۆن بەبادان : بریتییە لەیەکێك کەقسەی کۆن بکاتەوە.**

**کلاّوهەڵ دەدات : لەخۆشی دایە ، بەئامانج گەیشتووە.**

**کوشتی : دارکارییەکی زۆری کرد.**

**کەوتە ساجی عەلی : هیچی بەدەستەوەنەما.**

**کەوتۆتە سەرزمان : ناوی زڕاوە بۆتە بنیشتە خۆشەی سەرزمانی ئەم و ئەو.**

**گوێی شل کرد : هەرچی وتراو داخوازی لێ کرا بیستی و جێ بەجێی کرد.**

**گەسکیان لێدا : هیچیان تێدا نەهێشت.**

**لام وجیم : بریتییە لەکەمترین قسە لەجواب دا.**

**لای لێ دەکاتەوە : یارمەتی دەدات.**

**لێوگەستن : بریتییە لەپیشاندانی توڕەیی.**

**لووتی دەشکێنێت : دەیبەزێنێت و لەفیزی دەخات.**

**لەدەست دان : بریتییە لەنەمان و لەناوچوونی شتێك.**

**لەڕێ دەرچوون : بریتییە لەلادانی یەکێك لەڕەوشت و خووی جوان.**

**لەگەڵ مانگ شەڕدەکات : بریتییە لەیەکێك کەوەك مانگ جوانە ، بگرە لەویش جوانترە.**

**نایەڵێت هەناسە بدات : واتابواری هیچی نادات.**

**نێرە : بریتییە لەمرۆڤی ئازا.**

**هەڵگڕان : بریتییە لەدەوڵەمەندبوونی یەکێك بەزوویی.**

**ئەوڕۆسبەی : بۆنزیکبوونەوە بۆڕوودانی بەکاردێ.**

**جغارە خۆرێك : واتا ماوەیەکی کەم.**

**چاوقوچانێك : ماوەیەکی زۆرکەم ، چەند چرکەیەك.**

دنیاڕووناکە : کات ، وەخت ،کاتێك کەشەوکۆتایی پێهاتووە، بەڵام هێشتاخۆرهەڵ نەهاتووە٠
دنیاتاریك بوو : واتاشەوداهاتبوو٠
دنیا ساردبووە : واتا هەوا ساردبووە٠
دنیا گەرم بووە : واتا هەوا گەرم بووە٠
دنیاپێنج و دوو ڕۆژێکە : واتا ماوەیەکی کەمە٠
دنیا بەئومێد خورایە : واتا دەبێ مرۆڤ گەشبین بێ بەدوارۆژ٠
دەققەیەك : دەققە (٦٠) چرکە ، خولەك ، بۆماوەیەکی کورت بەکاردێ٠
دەم دەمی : جارێك نا جارێك٠
بەجوملەی سەعاتەکی : سەعات (٦٠) دەقیقەیە ، وەك مەجاز بۆماوەیەکی کەم بەکاردێ
هەروەها لەکاروباری سەربازی بەکاردێ بۆمۆڵەتدان وەك (٢٤) سەعات یان (٤٨) سەعات ،
سەعات سفر بۆهێرش بردن٠
هەزار ساڵ : بۆماوەیەکی یەکجار زۆربەکاردێ ، (هەزارساڵە) واتا (زۆرلەمێژە)٠
ئاساری لەسەرپاتاری نەماوە : شیرازەی تێکچووە ، هیچ شتێکی لەجێی خۆیدا نەماوە٠
ئاسمان و ڕێسمان : ڕێسمان واتا پەت و گوریس بۆبەراوردکردنی دووشت کەناگەن بەیەك
وەك چۆن گوریس نییە بگاتە ئاسمان٠
ئاشی نەزان خوادەیگێڕێت : بەیەکێك دەڵێن کەکارەکەی بۆجێ بەجێ ببێت لەگەڵ ئەوەدا
کەنەزان و نەشارەزایە٠
ئاگری گرتووە : بەیەکێك دەڵێن زۆرببزوێت و هاروهاج بێت٠
ئاگری لەماڵی بەردا : ماڵوێرانی کردوئاژاوەی خستە ناوخێزانەوە٠
ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە : واتا خۆم سەلامەت بم ، چ کارم بەسەرئەم وئەوەوە هەیە٠
ئاگری بن کایە : بەیەکێك دەوترێت کەبەنهێنی ئاشووب بگێڕێت و خەڵك بەگژیەکدابدا٠
بازاڕی گەرمە : شتەکە زۆردەفرۆشێت٠
بۆتە پیاو : هۆشی هاتۆتەوە سەرخۆی و لەخراپە دوورکەوتۆتەوە٠
بۆرە خزم : خزمێکی دوور
پارەی نوستوو : پارەی پاشەکەوت

پاشاگەردانی : شیرازە تێکچووە و کەس گوێ ناداتەکەس و هەرکەس بۆخۆیەتی٠

پشتی گرتووە : یارمەتی داوە ، لەسەری دەکاتەوە٠

پشتی لەعەردی دا : ناپاکی لەگەڵداکرد و زیانێکی زۆری لێدا٠

تەڕەماشی بۆکردووە : واتا هیچی بۆنەکردووە٠

جەرگ ئاوس بووە : خەفەتی بەدەستەوە زۆرخواردووەو بێزاربووە٠

چاوبەرەوژێرە : قەرزاری چاکەوپیاوەتییە٠

چاوی بەرایی نایەت : دڵی نایەت ئەوشوێنە یان ئەو کەسە ببینێت یان بەوشوێنەدا بڕوات ، چونکە یادی کەسێك یان ڕۆژانێك یان شتێکی خۆشەویست بیری دەخاتەوە ئەویادە خەفە تی دەداتێ٠

چاوی ڕۆن بۆوە : بینینی ئەوکەسە شادی کردووە٠

قوربەسەر : بۆداخ و خەفەت ، بەزەیی ، هەڕەشە لێکردن دەوترێت٠

خاووخێزان : خێزانەکە هەمووی٠

خەمت نەبێت : دڵنیابە٠

خەونی پێوە دەبینێت : تامەزرۆیەتی ، ئاواتە خوازی ئەوشتەیە٠

خەیاڵ پلاْوە : ئاوات خواستنی شتی بەرزە ، کەدەست نەکەوێت و نەیگاتێ وەك پلاْوێك کە هەژارێك خەیاڵی بۆبکات٠

دەستی سووکە : ئازاری نەخۆشەکە نادات٠

دەڵێی چێشتی مجێورە : بەشتێك دەڵێن کەلەگەلێك شت پێکهاتبێ ، تێکەڵ کرابێ کارگوزار ی مزگەوت جاران ئاوایی دەیان ژیاند و چێشتیان دەدایێ چێشتەکە هی چەند ماڵێك بوو ئەویش هەمووی لەیەك دەفردەکرد٠

نەبای دیوە نەباران : بەیەکێك دەڵێن کەلەسەرکارێك سزایەکی سەخت درابێ کەچی دوای سزاکە دەست بەکارەکە بکاتەوە٠

دڵڕفێن : زۆرجوان

دڵ لەدڵ مەدە : دڵنیابە ، بێگومان بە٠

دڵمردووە : بەتەنگ جوانی و ڕازاندنەوەی پۆشاکی خۆیەوە نایەت٠

دڵی ئاوی خواردەوە : دڵنیابوو ، ئاسوودەبوو٠
دڵی پڕە : خەفەتبارە خواردنی پێناخورێت٠
دڵی دایەوە : دڵنەوایی کرد٠
دڵی گوشراوە : دڵی تەنگە ، خەفەتبارە٠
دڵی نەرم بووە : سۆزوبەزەیی جولاوقایل بوو٠
ڕازونیاز : نهێنی دەروون و ئارەزووی دڵ٠
قات و قڕییە : قات ، (قحط)ی عەرەبییە واتا شت ، خواردن دەستناکەوێت٠بەکاردەهێنرێت بۆنەبوونی هەموو شتێك کەکەم بێت و بەگران دەست بکەوێت٠
ئاخر زەمانە : یەکێك ئەمە دەڵێت کەشتێکی سەیروسەمەرە ببینێت یان شتێکی نابەجێ و نەشیاو هەروەها بەڕۆژگاری ناخۆش دەڵێن کەکەس ئاگای لەکەس نەبێت و هەرکەس لەهەو لی خۆی دابێت٠
ئاگردەبارێت : هەوا زۆرگەرمە ، ئاشووب و جەنگە٠
ئاوڕی لێدایەوە : یارمەتی دا٠
ئەقلی نایبڕێت : بیری بۆناچێت و بڕوای پێناکات٠
ئەقلی پێ ناشکێت : تێناگات٠
ئاگری لێ دەبارێت : زۆرتوڕەبووە٠
بارسووکە : ئەرکی سەرشانی کەمە ، مەسرەفی کەمە٠
بەهەزار چەرمەسەری : بەنارەحەتییەکی زۆر٠
بلێ ماست ڕەشە دەلێ ڕەشە : مرۆڤێکە بیرناکاتەوە دوای بەرژەوەندی خۆی دەکەوێت٠
بۆگەن : ڕەوش و باری ڕژێمێکە خراپەکاری لەسنوردەربچێت٠
بازاڕی مردووە : شت نافرۆشرێت٠
پەلی هاویشت : بلاْوبۆوە٠
پشتی بەردا : وازی لێهێناوکۆمەکی نەکرد٠
خۆخۆری : ناتەبان ، دوژمنی یەکن٠
خودانەناسە : بێ ویژدانە٠

زوخاوی لێ دەتکێت : داخ و مەرەق و خەفەتی زۆرە٠
زۆڵە : زۆرزانە و زیرەکەو فێڵبازە ، ناپاکەوبۆئامانجەکانی هەموورێیەك دەگرێت٠
ژەهری مارە : بۆشتی تاڵ و دژواروناخۆش دەوترێت٠
گیانی دەرچوو : زۆرشەکەت و ماندووبوو٠
گوێی باش ڕاکێشا : تەمێی کردوهۆشیاری کردەوە٠
تاخاوەن ماڵ دزی گرت ، دزخاوەن ماڵی گرت : واتا هەتا ماف خوراو دەستدرێژیکاری تاوا نبارکرد ، دەستدرێژیکار ماف خوراوی تاوانبار کرد٠
سەگ ساحێبی خۆی ناناسێت : واتا شوێنەکە تەواو قەرەبالەغ و جەنجاڵە پڕە لەهەراوژاوە ژاو کەس بەکەسەوە نییە کەس ناتوانێت ئەوکەسە بدۆزێتەوە کەمەبەستییەتی٠
سەگی هارتەمەنی چل شەوە : واتا مرۆڤی تاوانبارو سەرەڕۆ ناوەستێت بەمەش ڕۆژلەدوای ڕۆژ دوژمنانی زیاد دەکەن تارۆژێك یەکێکی لێ ڕاست دەبێتەوە بەمەش تەمەنی کورتەو زو وتیادەچێ٠
بەردی گەورە نیشانەی نەهاویشتنە : واتا بەڵێنی گەورە نیشانەی جێ بەجێ نەکردنییەتی
بەردی پێنادات سەری خۆی پێ بشکێنێ : بەکەسێك دەوترێ بەرامبەرکەسێکی خۆی بێکە ڵك بێ٠
بەرد لەجێی خۆی سەنگینە : یانی مرۆڤ لەولاّتی خۆی نرخ و ڕێزی هەیە ، بەلاّم کەلە زێد ی خۆی دەرچوو لەوێ خەڵك نایناسن لەبەرئەوە بێنازەو وەك پێویست ڕێزی ناگرن٠
سکی پێ دێشی : واتا پێی ناخۆشەو بەمە ئازاری پێدەگات٠
جادە دەپێوێ : کەسێکی بێکارە بۆخۆی پیاسە دەکات٠
جام کەپڕبوو لێی دەڕژێ : واتا مرۆڤ کەزۆری بۆهات زۆری پێکرا دەست دەوەشێنێ ،چونکە تاقەت و سەبری ئادەمیزاد سنورداره تا سنوری خۆی خۆی پێدەگیرێ و بێدەنگ دەبێ کەلە وە زیاتری خرایە سەر ئیدی مێشك و دڵی پڕدەبێ دێتە کەف و کوڵ و لەوە زیاتر ناتوانێ بێدەنگ بوەستێ هەروەك چۆن جام کەلەگرتنی خۆی زیاتری تێکرا لێی دەڕژێ٠
لەبێ خەبەران کەشکەك سەڵەوات : بەکەسێکی بێ ئاگا دەوترێت کەبێ ئاگایە لەدنیا٠
لەتۆحەرەکەت لەخوا بەرەکەت : واتا تۆئیشت لەسەرە ڕزقیش عایدی خوایە٠

لەدەمی خۆی دەگرێتەوە : واتا لەخواردنی ڕۆژانەی خۆی دەگرێتەوە پاشەکەوتی دەکات•
دارهەڵبڕە سەگی ناپاك دیارە : واتا بەبچوکترین بەدواداچوون ئینسانی ناپاك دەردەکەوێت واتا هەرقسەیەك بکەی یەکسەردەیباتەوە سەرخۆی•
لەوکەسە بترسێ لەخوا ناترسێ : مەبەست ئەوەیە ئەوکەسەی لەخوانەترسێ بێویژدان و د لڕەق و بێ بەزەییە•
دارێکم بەدەستەوەیە هەردووسەری پیسە : بۆنموونە دووکەس ، دووخزم ، دوودۆست وەکو یەکە بۆی شەڕیان بێ ئەم لەنێوانیان گیربخوات نەزانێ چی بکات لەسەرهەرکامێکیان بێتە قسە لای ئەوی تریان پیاوخراپ دەبێ•
چەم بێ چەقەل نابێ : واتا هیچ شوێنێك یان کۆمەڵێك نییە پیاوی خراپی تێدانەبێ•
پەنجەی دەست هەموو وەك یەك نین : هەمووکەسەکان وەك یەك نین هەموویان چاك یان خراپ نین ناکرێت یەك حوکمی ڕەهایان بەسەردابدرێت ، چونکە هەم چاکیان تێدایە هەم خراپ•
حەوالەی خوای بکە : بەکەسێك دەوترێ کەمافی لای کەسێك بێ ئەوکەسە نەیەوێ بیداتە وە خاوەن مافەکە خۆی ماندوو نەکات بیداتە دەست خوای تاتۆڵەی لێ بستێنێ•
خوا لەسوڵتان مەحموود گەورەترە : واتا ئارام بگرە خوا لەهەموو گەورەیەك گەورە ترە ئە وهەموو ترسەی ناوێت ئەمە بەکەسێك دەوترێ کەبەدەست زۆردارێکەوە گیری خواردبێ بە رامبەریش هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی نەبێ•ئەمەش مەبەست سوڵتان مەحموودی غەزنەوییە کەدەکەوێتە بەهانە لەدارتاشێك و پێی دەڵێ : ئەمشەو تا بەیانی ئەوەندە فەردە مشارە ئار دەم بۆئامادەنەکەی لەملت دەدەم•دارتاشەکە (نجار) دەچێتەوەماڵەوە دەست دەکات بەقوڕ پێوان و شیوەن ، بۆژنەکەی دەگێڕێتەوە ژنەکە دەزانێ داواکەی سوڵتان لەسەرووی توانەاوە یە ، بەمێردەکەی دەڵێ : خەم مەخۆ ، خوا لەسوڵتان مەحموود گەورەترە دارتاشی بەستە زمان تابەیانی لەترسان خەوناچێتە چاوی ، بەیانی زوو لەدەرگا دەدەن دەیکاتەوە پیاوەکا نی سوڵتانن پێی دەڵێن ئادەی زوو بکە تابووتێکمان بۆبتاشە سوڵتان مردووە•
خوادەرگایەك دەگرێ و دەرگایەك دەکاتەوە : واتا لەسۆزوبەزەیی و میهرەبانی خوا بێ هیوا

مەبە ، خوا شتێك دەباتەوە شتێکی تر دەبەخشێ واتا کەسێك شتێکی زۆرگرینگ و چاکی لەدەست چووبێت پەریشان بێت کەسێکی تریش پێی دەڵێ : خوا قەرەبووت بۆدەکاتەوە.
خێربۆخۆیش نەك بۆدەرویش : واتا خێروچاکە لەگەڵ خزم و کەس و کاردا چاکترە لەوەی لەگەڵ بێگانەدابیکەیت.
چاکەبکەوبیدەبەئاودا : واتالەبەرخودا خێربکەوبیبەخشە.
دارپوازی خۆی نەبێت ناقلیشێت : واتائینسان لەڕێگەی خزم و کەس وکاری دا شکستی بە سەردێ.
دارکرمی لەخۆی نەبێ هەزار ساڵ دەژی : واتا ناپاکی ناوەخۆ.
داوم لەداوی نابێتەوە : واتا تووشم بەتووشی بووە و لەکۆڵم نابێتەوە.
دانوویان پێکەوە ناکوڵێت : واتا تەبیعەتیان لەگەڵ یەك ناگونجێ و بەیەکەوە ناگونجێن.
لەدوای ناخۆشیان خۆشییە : واتا ژیان لەسەر یەك شێوە ناڕوات ، بەکەسێك دەوترێت کە لەناخۆشیدایە و خەریکە بێ ئومێد دەبێ.
دنیا دەوران دەورانە : واتا دنیا هەمیشە لەگۆڕان دایە هەرسەردەمێك دەورودەسەڵاتی کە سێکە.
دەوەرە ئەم کەرە لەم قوڕە دەربێنە : کەرکەکەوتە قوڕاوەوە زۆر بەزەحمەت دەردەهێنرێت ئەو کەسەش لەبەر نەزانی و بێ عەقلی بەگوێی ناکات.
ڕاست و چەپی خۆی ناناسێت : واتا قازانج و زەرەری خۆی نازانێت.
زامی خەنجەر سارێژدەبێت ، زامی قسە سارێژ نابێت : واتا ئێش و ئازاروکاریگەری قسەی ناخۆش زیاترە و بەردەوام ترە لەهی خەنجەر.
زمان بەڵای سەرە : زمان بۆئینسان سەرچاوەی بەڵاو گرفت و زەرەرە ، کەزۆربەی ئەوگر فت و کێشەو ڕووداوانەی کە ڕوودەکەنە مرۆڤ لەزمانییەوە سەرچاوە دەگرن کەواتە ناسە لامەتی لەزمانەوەیە.
پارە پارە ڕادەکێشێت : ئەمە لەکاتێکدا دەوترێت کەمرۆڤی پارەدار پارەکەی دەخاتە گەڕ ومامەڵەی پێدەکات.
پارە چلکی دەستە : واتا ئەوپارەیەی کەدێتە دەست بۆهەمیشە لەناودەست نامینێتەوە هە

**روەك چۆن تەپ و تۆزو چلكی دەست بەشووشتن دەڕوات پارەش بەخەرجكردن دەڕوات و نامینێتەوە٠**

**زەرەر لەنیوەی دا بگەڕێتەوە قازانجە : مرۆڤ لەهەركارێكدا كەزانی زەرەردەكات باشترواية زوو لێی بكشێتەوە٠**

**پارەی سپی بۆڕۆژی ڕەش : واتا پارە لەكاتی تەنگانە گیروگرفتی ئینسان دەڕەوێنێتەوە٠**

**جوانی ژن بەیانییان دەردەكەوێت : چونكە جوانی ڕاستەقینەی بێ فێڵی ژن لەكاتی لەخەو هەڵسان دا دیارە ، چونكە ئارایشەكەی شێواوە یان پێوەی نەماوە كەوتۆتە سەرباری ڕاستە قینەی خۆی هێشتا مكیاژی نەكردووە٠**

**كەوئەوكەوەیە بەرامبەر كەوبخوێنێ : واتا ئازا ئەوكەسەیە لەڕووی بەرامبەرەكەی دا قسە بكات نەك لەپاشملەدا٠**

**كای كۆن بەبادەكات : قسەی كۆن دێنێتە ناوەوە٠**

**سوارتانەگلێت نابێت بەسوار : واتا مرۆڤ تاهەڵەنەكات و تووش نەیەت ئەزموون پەیداناكات و فێرنابێ بۆیە نابێ سارد بێتەوە و وازلەكارەكەی بێنێت٠**

**سەدی وەك تۆم ئاوداوەو هێناوەتەوە : واتا زۆركەسی وەك تۆی فێڵباز بەسەلامەتی لێی بوو مەتەوە و بەتەمای فێڵ لەمن بكەی٠**

**سەد ساڵ بكەی بێگانە پەرستی دەبێ دوایی بێنی نوشوستی : واتا ئەنجامی بێگانە پەرستی چەند درێژە بكێشێت هەرشكست هێنانە٠**

**سەد گوناە و یەك تەوبە : لەئاینی ئیسلام تەوبەی ڕاستەقینە هەموو گوناهەكانی پێشوو د ەشواتەوە٠**

**تێرئاگای لەبرسی نییە : واتا ئینسانی بێ گیروگرفت بێ ئاگایە لەگرفتی كەسانی دیكە كە خۆی گرفتی نەبێ٠**

**غەزەب دەبارێ : واتا خوامان لەخۆمان ڕەنجاندووە و تۆڵەمان لێ دەستێنێت ، كەگرانی و و شكە ساڵی ڕوودات یان كارەساتێكی گەورەی سامناك ڕوودات یاخود دەر و بەلاَ ولاَت بگر ێتەوە٠**

**زۆرگوتن قورئان خۆشە : واتا زۆرگوتن بۆئینسان باش نییە بەوكەسە دەوترێ كەزۆردەدوێ**

یان قسەی درێژە ،چونکە درێژدادڕی ئینسان تووشی بێزاری دەکات یان زۆرنووسیت هەربیە وێ لاپەڕەی پڕکاتەوە خوێنەر بێ تاقەت دەبێ لە خوێندنەوەی ، قسەی درێژ و زۆرگوتن ڕ ێزی ئینسان کەم دەکاتەوە٠

من مردوو، تۆزیندوو :

وەکوگریمانە دەوترێت ، ئەوجا دەڵێی فلاّن ڕاستی وت قسەکەی ڕاست دەرچوو٠

## هیوایەتەکانی مرۆڤ :

ناصرِی سوبحانی لەکتێبەکەی دا : (بەندایەتی) دەڵێ : ((وادانێین ئینسانێك لە شارێکدایە هیچ پلەوپایەکی نییە ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم ئارەزووە دەکەوێتە سەری کەببێ بە بەڕێوەبەر ی ناحییەی شارێك دوای ماوەیەك ئارەزوویێکی گەورەترلەدڵی دا پەیدا دەبێ سەیردەکات لە سەرووی خۆیەوە قائیمقام هەیە ئیترئەوئارەزووە دەکەوێتە دڵی کەبگابەومەقامە کەبووە قا ئیمقام سەیردەکات لەسەرووی ئەویشەوە پارێزگارهەیە پارێزگارگەورەترە ئاواتەکەی گەورە تریش دەبێ کەبووە پارێزگار لەسەرووی ئەویشەوە بۆنموونە وەزیری ناوەخۆ هەیە خۆزگە ی دەکەوێتە دڵی کەببێ بەوەزیری ناوەخۆ ، ئەگەربووە وەزیری ناوەخۆش لەسەرترەوە سە رۆك وەزیران هەیە یان سەرۆك کۆمارهەیە لەبەرئەوە شتێ بووە ئاوات دەستی نەکەوت خە فەتی بۆدەخوات بۆیە تاپلەوپایەی زیاتربێ خەفەتی زیاترە ، بەلاّم کەسێك کەئاواتی کەمتر ە خەفەتی کەمترە ، لەلایەکی ترەوە ئەوەی پلەوپایەی نییە ترسی ئەوەی نییە شتێکی لەد ەست بچێ بۆیە ناترسێ ، بەلاّم کەبووەشت ترسی ئەوەی هەیە ئەوشتەی لەدەست بچێ ،چو نکە کەسانی تریش هەوڵ دەدەن بۆئەوەی جێگاکەی بگرن ، هەروەها سەروەت و سامانیش بەهەمان جۆرە ، کەسەروەت زۆرتربوو ئاواتیش زۆرتردەبێ بەپێی زۆربوونی سەروەتەکەی خەفەتیشی زۆرتردەبێ بۆنموونە کابرایەك لەدێیەك دوکانێکی بچووکی هەیە سەرمایەکەی کەهەیەتی (١٠٠٠٠) دەهەزارتمەنە بەقەدەر (١٠٠٠٠) دەهەزارتمەنەکە دەترسێ ، ئەوەی کە ملیۆنێکی هەیە بەقەدەرملیۆنێك دەترسێ٠

(  )پیاوێکی زیندانییە دەڵێ : ((ئەگەرئازاد بکرێم دەبمە بەختەوەرترین مرۆڤ لەجیهان دا٠ دەڵێ : ئازادی یەکێکە لەونیعمەتانەی خوای گەورە بەمرۆڤی بەخشیووە ، کاتێك مرۆڤ هە ست بەونیعمەتە دەکات کەلەزیندان خۆی دەبینێتەوە کاتێك لەکەس وکاروماڵ ومنداڵت دووری شەووڕۆژلەژورێکی پڕاوپڕلەزیندانی بیت ، بێئەوەی ڕەچاوی لایەنی تەندروستی و کۆمەلاّیەتی و پیشەیی وکەسایەتی و دەروونیت بکەن لەگەڵ کۆمەڵێك زیندانی وەك دز ، پیاوکوژ ، شەرواڵ پیس ، حەبخۆر ، ٠٠٠تاد٠بێگومان ناخۆشترین شوێنی دنیا زیندانە))٠

**ناولێنان :**

**كە منداڵ لەدایك دەبێت یەكەمین شت ئەوەیە ، كەناوێكی چاكی لێ بنرێت ، درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((انكم تدعون یوم القیامة بأسمائكم ، وأسماء ابائكم ، فاحسنوا أسماءكم))٠

**واتا : ((ئێوە لەڕۆژی دواییدا بەناوی خۆتان و باب و باپیرتان بانگ دەكرێن ، جالەبەرئەوە ناوی چاك لەخۆتان (واتا لەمنداڵەكانتان) بنێن))٠هەروەها فەرموویەتی :** ((تسموا بأسماء الأنبیاء ، وأحب الأسماء الی الله تعالی : عبدالله وعبدالرحمن ، وأصدقها : حارث و همام ، وأقبحها حرب ومرة))٠

**واتا : ((منداڵەكانتان بەناوی پێخەمبەرانەوە ناوبنێن ، خۆشترین ناویش لای خوای گەورە : (عبدالله و عبدالرحمن)ە ، وەڕاسترینیش : (**حارث **و همام)ە ، ناشیرینترین ناویش : (حر ب و مره)یە))٠**

حارث : **جوتیار**

**همام : ئەوكەسەیە ئەگەر ویستی كارێك بكات هەوڵی زۆری بۆدەدات٠**

**حرب : شەڕوجەنگ (جەنگی)**

مرة : **تاڵ**

**هەروەها فەرموویەتی :** ((لاتسمین غلامك یسارا ولارباحا ولا نجیحا ولاأفلح))٠

**واتا : ((كوڕەكەت ناومەنێ یسار واتا چەپ ، رباح بەمانای قازانج ، نجیح ئەوكەسەیە هەمو وڕایەكی ڕاست بێت ، افلح ئەوكەسەیە هەرشتێك كەدەیەوێت بەدەستی دەهێنێت))٠**

**هەروەها فەرموویەتی :** ((لأنهین أن یسمی رافع وبركة ویسار))٠

**واتا : ((قەدەغەی دەكەم منداڵ بەناوی رافع واتا بەرزكەرەوە ،** بركة **واتا فەروبەرەكەت ، یسار بەمانای چەپ ناوبنرێت))٠**

**لەبارەی بچووكردنەوەی ناو ، أنس خوالێی ڕازیبێ ، وتوویەتی : پێخەمبەر(درودی خوای لە سەربێ) یاری لەگەڵ زینب كچی أم سلمە دەكرد و دەیفەرموو : یازوینب ، یازوینب واتا : زە ینەبۆكە ، زەینەبۆكە٠**

**(ب) دەڵێ : ((ناوی كۆرپەكەمان ناوە بەناز، چونكە ناوێكی كوردی خۆشە هەروەها ئەم كچە نۆبەرەمانە دڵنیام كەبەناز دەبێ بۆیە ناوی (بەناز)مان بۆهەڵبژاردووە))٠**

(س) دەڵێ : ((منداڵەکەمان ناوی (هەندرین)ە ، چونکە بەئەصڵ خەڵکی بناری هەندرێنم ، هەندرێنیش چیایەکی سەرکەشی کوردستانە))٠

(ت) دەڵێ : ((کوڕەکەم ناوی (ڕێگر)ە، ناوەکەی دەگۆڕم بۆهاوکار، چونکە ڕێگرواتاکەی ناخۆ شە دەلالەت لەڕەفتارێکی خراپی مرۆڤ دەکات))٠

(ع) دەڵێ : ((ناوی کۆرپەکەم دەنێم (هیوا) ، چونکە خۆم دڵ پڕلەهیوام ، هەروەها ناوێکی خۆشە))٠

(ع) دەڵێ : ((یەکێك لەهاوەڵەکانی پێخەمبەر(درودی خوای لەسەربێ) ناوی (گاوان)بووە ، کەبۆتەموسوڵمانیش داوای لێ نەکراوە ناوەکەی بگۆڕێ کەبەرلەئاینەکە ئەوناوەی هەبووە٠ ئەگەرباوکەکە مرۆڤێکی ڕۆشنبیربێ دوای زانینی واتای ناوەکە ناولەمنداڵەکەی دەنێ ، بە لاَم ئەگەربەشێوەیەکی لاساییکردنەوە ناولەمنداڵەکەی بنێ ، ڕەنگە ناوێکی لێ بنێ کەمانا یەکی خراپ ببەخشێ وەك (سرحان) واتا (گورگ)٠

ناوی لێکچوو لەپیتی یەکەم : قادر ، قاسم

ناوی لێکچوو لەپیتی کۆتایی : أحلام ، الهام

ناوی منداڵ لەسەرکێش وسەروای ناوی باوکی : جابرصابر

هەمان ناوی باوك : علی علی

کات بەزۆری بۆتە ناوی ناوی کچان وەك :

بەهار ناوی کچانە

ڕۆژان ناوی کچانە

نەورۆز ناوی کچانە

ئێڤار ناوی کچانە

سەحەر ناوی کچانە

بەیان ناوی کچانە

شەوگار ناوی کچانە واتا شەوکات ، کاتی شەو

ناوو ماناكەی :

سۆما : بینایی چاو٠(وشەی سۆما لەزمانی سانسكریتی دا (هیندی) بەمانای مانگ پەیوەند ی چییە ؟ مانگ واتای ڕووناكی تێدایە واتاكە گوازراوەتەوە بۆڕووناكی چاو ، بینایی چاو ، توانای بینین)٠

عبود : ئەوكەسەیە زۆرعیبادەت دەكات٠

أیوب : الأوب ، التوبة

باسل : ئازا ، پاڵەوان

حارس : پاسەوان

حارث : جوتیار

حەجاج : ئەوكەسەیە كەزۆرحەج بكات٠

خطاب : خطیب ، ئەوكەسەیە زۆرخوتبە بدات٠

ڕەشاد : ڕێگای ڕاست

زین العابدین : أحسن العابدین ، خیرالعابدین

سفیان : خێرایی لەڕۆیشتن ، با ، الریاح

شوقی : شەوق

شەوكەت : بەهێز ، شان وشەوكەت

صهیب : خاوەن ڕەنگی مەیلەوسوور

عمران : ئاوەدانكردنەوە

عمید : گەورەی قەوم ئەوەی اعتیمادی لەسەردەكرێ٠

عواد : ئەوەیە سەردانی نەخۆش دەكات٠

قەزاز : فرۆشیاری حەریر (ناسناوە)

مظفر : سەركەوتوولەجەنگ ، هەمیشەلەجەنگ دا سەركەوتووە٠

نبیلە : ڕەسەن ، شەریف ، نەجیب (بۆئافرەت)٠

نجلا : ئەوەیە چاوی گەورەوجوانە

نەجیبە : چاك ، بەڕێز

**نەجیم : ڕووەکە**

**نعمان : نیعمەت**

کلثوم : **پڕبووی گۆشتی دەم وچاو**

**ئینعام : بەخشین**

**بهیە : ئەوەیە ڕوخساری جوانە**

دینة : **قەرزی دواخراو ، تاعەت**

عائیشة : **زیندوو**

**مەسعود : بەختەوەر**

**درووی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((خوا نەوەدونۆ ناوی هەیە ، هەرکەسێك لەبەری بکات دەچێتە بەهەشتەوە))٠**

**تێبینی : -**

**دەبێ هەڵسێ بەجێبەجێ کردنی واتای ئەوناوانە بۆنموونە ئەگەر وتی : المنتقم ترسی لێ دە نیشێت لەئاست تۆڵەسەندنەوەی خوای گەورە بۆیە تەنیاژماردن ولەبەرکردن نییە ، بەڵکو مەبەست لێی کارتێکردنی ئەوناوانەیە٠**

**خوای گەورە دەفەرموێ :** {ولله الأسماء الحسنى فادعوه بها } الأعراف : ١٨٠

**واتا : (بەوناوە جوانانەی خوا نزابکەوهاناوهاواربۆئەوزاتەبەرن)٠**

**ناوە جوانەکانی خوا (جل جلالە) :**

**ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە ، کەپێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) فەرموویەتی :** ((هوالله لااله الاهوالرحمن الرحيم الملك القدوس السلام المؤمن المهيمن العزيز الجبار المتكبر الخالق البارىء المصور الغفار القهارالوهاب الرزاق الفتاح العليم القابض الباسط الخافض الرافع المعز المذل السميع البصير الحكم العدل اللطيف الخبير الحليم العظيم الغفور الشكور العلى الكبير الحفيظ المقيت الحسيب الجليل الكريم الرقيب المجيب الواسع الحكيم الودود المجيد الباعث الشهيد الحق الوكيل القوى المتين الولى الحميد المحصى المبدىء المعيد المحيى المميت الحى القيوم الواجد الماجد الواحد الصمد القا در المقتدر المقدم المؤخر الأول الأخر الظاهر الباطن الوالى المتعالى البر التواب المنتقم العفو الرءوف مالك الملك ذوالجلال والاكرام المقسط الجامع الغنى المغنى الما نع الضار النافع النور الهادى البديع الباقى الوارث الرشيد الصبور)) رواه الترمذي و ابن حبان والحاكم والبيهقي٠

الله : ئەم ناوە مەزنترین نەوەدونۆناوەکەیە هەمووناوەکانی ترسیفەتی ئەوزاتەن ، هەروەها ئەم ناوە تایبەتمەندترین ناوەوکەس ناتوانێت بۆکەسێکی ترجگە لەخوا بەکاری بێنێت ، بە لاّم ناوەکانی تر دەتوانرێت بۆکەسانی ترجگە لەخوا بەکاربهێنرێت وەك : قادرورەحیم و٠٠ تاد٠(هەمووی نا بۆنموونە المتكبر تەنها بۆخودا بەکاردەهێنرێت)٠

الرحمن : بەبەزەیی ، داتاشراوە لە (الرحمة) ، خاوەن سۆزوبەزەییە بۆبەندەکان٠

الرحیم : داتاشراوە لە (الرحمة)

الملك : پادشا

القدوس : پاك وبێگەرد

السلام : سەلامەتی

المؤمن : دلّنیاکار ، ئەم ناوە هەندێك جارمەبەست پێی (تصدیق)ە ، لەوانەشە لە (الأمن) داتاشرابێت ، کەمانای ئاسایش وئارامی وئەمان بێت٠

المهیمن : ڕاوەستاوە لەسەردروستکراوەکانی لەڕووی کاروکردەوەکانیان وڕۆزی وئەجەلەکانیا نەوە بەئاگاداربوون ودەستگرتن بەسەریان دا٠

العزیز : زالّ ، دەسەلاّتدار

الجبار : بالاّدەست

المتكبر : ئەوکەسەیە هەمووان بەکەم ونزم تەماشادەکات بەراورد بەزاتی بالاّی خۆی٠

الخالق : دروستکار

البارئ : بەدیهێنەر

المصور : وێنەکێش

الغفار : لێبوردە ، ئەم ناوە ئاماژەیە بۆزۆری (غفران) واتا جارلەدوای جارلەگوناه خۆش دە بێت٠مانای (الغفر) لەزمانی عەرەبی دا واتا (الستر — داپۆشین)

القهار : ئەوکەسەیە پشتی زالّمان لەدوژمنانی دەشکێنێت بەسەریان دا زالّ دەبێت وزەلیلیان دەکات٠

الوهاب : بەخشەر

الرزاق : ڕۆزی دەر

الفتاح : دەرووكەرەوە

العليم : زانا

القابض : لێگرەوە

الباسط : فراوانكار

الخافض : دانەوێن

الرافع : بڵندكار

المعز : زاڵكار

المذل : زەبوونكەر

السميع : بيسەر ، ئەوكەسەيە تەپەی پێی مێروولەيەكيش دەبيستێت ، حەمدی حەمدكەرا ن دەبيستێت وپاداشتيان دەداتەوە دوعای دوعاكەران دەبيستێت ووەڵاميان دەداتەوە٠

البصير : بينەر

الحكم : بريتييە لەحاكمێكی فەرمانڕەوا٠

العدل : دادگەر ، ئەوكەسەيە كاری عەدل دژبەجەوروستەمی لێوە سەرهەڵدەدات٠

اللطيف : نەرم ونيانی دژبەتوندوتيژی٠

الخبير : شارەزا

الحليم : هێدی ، ئارام

العظيم : مەزن

الغفور : لێبوردە

الشكور : سوپاسگوزار

العلي : بەرز

الكبير : گەورە

الحفيظ : پارێزەر

المقيت : ماناكەی دروستكەری ڕۆزی (قوت) ، خۆراك دەگرێتەوە٠

الحسيب : لێپرسەرەوە

الجليل : سيفەت بەرز

**الكريم : بەڕێز**

**الرقیب : چاودێر**

**المجیب : وەڵام دەرەوە ، ئەوکەسەیە دەچێت بەهانای داواکاری داواکارانەوە ودوعای دوعاکا رانەوە٠**

**الواسع : فراوان**

**الحکیم : کاربەجێ**

**الودود : ئەم ناوە لەمانای ناوی (الرحیم) نزیکە٠**

**المجید : پایەبەرز ، خاوەن شکۆ**

الباعث : **زیندووکەرەوە**

**الشهید : ئاگادار**

**الحق : ڕاست ، حەق بەرامبەر** (الباطل)**ە**

**الوکیل : پشت وپەنا**

القوي : **بەتوانا ، بەهێز**

**المتین : قایم ، بەهێز**

الولي : **دۆست ، یاریدەدەر**

**الحمید : ستایشکراو ، شایستەی سوپاس**

المحصي : **هەژمارکەر**

المبديء : **هەمووشتەکان لەخوداوە دەستیان پێکردووە لە**(ابداء)**هاتووە واتا دەستپێکردن٠**

**المعید : گێڕەرەوە**

المحیي : **ژێنەر**

**الممیت : مرێنەر**

الحي : **زیندوو**

**القیوم : ڕاوەستاو**

**الواجد : هەبوو**

**الماجد : خاوەن پایەی بەرز**

الواحد : تاك وتەنیا

الصمد : جێی نیازوبێ نیاز : حەوجێ پێبوو

القادر : تواනادار

المقتدر : خاوەن سەرچاوەی توانا

المقدم : پێشخەر

المؤخر : دواخەر

الأول : یەکەمین

الأخر : دوایین

الظاهر : دیار ، ئاشکرا

الباطن : پەنهان ، ون

الوالي : سەرپەرشتیکەر

المتعالي : زۆربەرز

البر : چاکەکار

التواب : تەوبە وەرگر

المنتقم : تۆڵەسێن

العفو : چاوپۆشیکەر ، ئەوکەسەیە خراپەوگوناهان دەسڕێتەوەوچاوپۆشییان لێ دەکات٠

الرؤوف : میهرەبان

مالك الملك : خاوەن مولك ، مولك بەمانای مەملەکەت دێت٠

ذوالجلال والأكرام : خاوەن پایەی بەرزوبەرێز

المقسط : دادپەروەر

الجامع : کۆکەرەوە ، وەك کۆکردنەوەی خەڵکی لەرۆژی مەحشەردا٠

الغني : دەوڵەمەند

المغني : دەوڵەمەندکار

المانع : پێشگیری کەر ، مەنع

الضار : زیان گەێن

**النافع : سوود گەيێن**

**النور : ڕوناكی**

الهادي : **ڕێ پیشاندەر**

**البديع : داهێنەر**

**الباقی : هەرماو**

الوارث : **میراتگر ، ئەوكەسەیە مولكەكان دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو پاش تیاچوونی خاوەن مولكەكان.**

**الرشيد : كارزان ، شارەزا**

**الصبور : ئارامگر**

**جینۆساید :**

زاراوەی جینۆساید وشەیەکی یۆنانییە لەدووکەرت پێکهاتووە : (جینۆ + ساید) یەکەمیان بەمانای ڕەگەز و دووەمیان بەواتای کوشتن دێ ، هەردوو وشەکە بەسەریەکەوە مانای کو شتنی ڕەگەزی مرۆڤ دەگەیەنێ٠لەمەفهوومدا مەبەست لێی قەتل وعام وئیبادەکردن وکو شتنی بەکۆمەڵ دەگەیەنێ٠لەنێوان سالآنی ١٩٨٧ — ١٩٨٩ حکومەتی بەعس جینۆسایدی ئە نجامدا ناوی نا ئەنفال٠لەدوای ڕاپەڕینی بەهاری ١٩٩١ چەندین گۆڕی بەکۆمەڵ دۆزرانەوە ، کەبەلگەی سەلمێنەری جینۆساید بوون لەنموونەی ئەوگۆڕە بەکۆمەلآنە لەشاری سلێمانی کۆمەڵێك گۆڕی بەکۆمەڵ دۆزرانەوە یەکێك لەوگۆڕە بەکۆمەلآنە (٣٧٠) ژن و منداڵ و پیا وی تێدابوو٠وەئەوخەڵکانەی بەشێوەیەکی ڕەمەکی دەگرت و بەبێ دادگاییکردن لەسێدارە دەدران ئەوانەی کەئیعدامیش دەکران لەپێشدا ئازاروئەشکەنجە دەدران ، کەشوێنەواری ئە ئەشکەنجەکان بەسەرلاشەکانیانەوە دیاربووە وەك برین و سووتان و نینۆك دەرکێشان و٠٠ تاد٠ئەمەش لەوکاتەی کەتەرمەکان بۆخانەوادەکانیان گێردراوەتەوە٠سەرباری ئەوەش بۆ هەرتەرمەی (٣٠٠) دیناریان لەکەس وکاریان سەندووە ، کە دەکاتە مووچەی چوار فەرما نبەری ئێستا٠ ئەمەش لەبەرامبەر ماندووبوونی ئیعدامکردنیان و گوللەی کوشتن و گوا ستنەوەیان دا٠دەستدرێژیکردنە سەرژن و دایك و خوشکی زیندانی و ڕووتکردنەوەیان لە بەرچاوی زیندانی وەك وەسیلەیەکی ئیعتراف پێکردن بەکاردەهات٠ نموونەی شێوازەکانی تەعزیب وەك شکاندنی پەنجە بەچەکوشی ئاسن و لەتکردنی زمان و بەرزکردنەوەی پلە ی گەرمای ژووری زیندانی بۆسەرووی (٥٠) پەنجا پلەی سەدی لەهاوین دا٠ هەروەها جێ هێشتنی تەرمی زیندانییە ئیعدامکراوەکان لەنێوهاوەلآنی دا بۆچاندنی ترس و لەرزو بلآ وکردنەوەی نەخۆشی ، هەروەها بۆتۆقاندن ڕۆژانە هەرجارەو لەژێرپەردەی بیانوێکەوە ژ مارەیەکی زۆر لەپیاوانی بەعس بەچەکەوە لەکاتی ناوەخت دا وەك نیوەشەو یان کاتی با نگی بەیانی بێ ئیزن بەماڵەکان وەردەبوون وحورمەتی ماڵەکانیان دەشکاندوهەمووشتێکیا ن دەپشکنی٠هەروەها بازرگانیکردن بەئافرەت و فرۆشتنی بەهەندێك لە بازاڕەکانی دەوڵە تانی وەك میسرو دەوڵەتانی دیکەی کەنداو٠کولآندنی زیندانی بەزیندوویەتی بەخستنە نا وەمەنجەڵی ئاوی داخ و کولآو تاگیانی لەدەست دەدا ، کەبۆ چێژوەرگرتن لەئازاروحەسانەوە

ی دەروونی ئەوکارەیان کردووە٠هەروەهاشکاندنی ددانەکان و شەویلاك بەهۆی لێدانی وە
حشیانەی بەردەوام ، هەروەها سووتاندنی شوێنی جۆراوجۆری لەش بەئوتووی کارەبایی ،
هەروەها تیٚ فرێدانی زیندانی لەچاڵی پیسایی و ئافرەت هەڵواسین دوای بەستنەوەی دە
ست و پێی ئەشکەنجەدراو بەقژیەوە و هەڵواسینی و لەفەلاقەدان و هەڵواسینی بەپانکەی
هەوایی بۆچەندین کاتژمێر هەڵدەواسراو لەدەم و چاوو سکی دەدراو ناچارکردنی زیندا
نی بەچاوی بەستراوو بەپیٚ خاوسی لەسەرتێل ودڕك بڕوات٠فڕێدانی زیندانی لەژوورێکی
پڕلەمێش هەنگوین و زەنگە سوورە بەمەبەستی پێوەدان و ئازاردان و ڕووتکردنەوەی زا
ناو پیاوی ئاینی ناچارکردنیان بەسەماکردن لە نێو زیندانییەکان دا٠ ناچارکردنی زیندا
نی (گەورەکان = بەرپرس) بەلاساییکردنەوەی دەنگی مانگاو پشیلە و سەگ و گوێدرێژو
گیانلەبەرانی تر٠لێدان لەکەللەی سەر لەپێناوی ئەوەی زیندانییەکە شێت ببیٚ و تووشی
نەخۆشییەکانی دەمارومێشك ببیٚ٠بەڕەللاکردنی سەگی هاری پۆلیس و مارودوپشك وقا
لۆچەوجرِوجانەوەری تر لەژووری زیندانییەکان دا٠هێنانی مشك و قالۆچەو جانەوەری
تر لەگەڵ خواردن و ناچارکردنی زیندانی بەخواردنی٠بەکارهێنانی لەشی ئافرەت بەڕوو
تی بۆقومارکردن و خواردنەوەی مەشڕووب لەسەری دا٠ئەشکەنجەدانی منداڵان لەبەرچا
وی دایك و باوکیان ، دەستدرێژیکردنە سەرئافرەت لەبەرچاوی مێردوبراوکەس وکاریان٠
هەروەها پاش ئەوەی ئەمریکا لەلایەن کۆلۆمبوسەوە دۆزرایەوە ئیسپانییەکان و پورتوگا
لییەکان خۆیان ئامادەکرد ئەم وڵاتە داگیربکەن وبیٚ سڵەمینەوە کۆکوژیان بکەن ، ئیسپا
نییەکان منداڵیان دەکوشت و ژنی سکپڕیان سك هەڵدەدڕی و خاوو خێزانەکانیان بەماڵە
کانیانەوە گڕتێبەردەدا و سەگە مەشقپێکراوەکانیان ڕەوانەی دارستانەکان دەکرد تا سوور
پێستە هەڵاتووەکان پارچە پارچە بکەن٠لەبەرچاوی مێردەکانیان دەستدرێژییان دەکردە
سەرژنەکانیان ئا بەم شێوەیە هیندییە سوورەکانیان قەتل و عام دەکرد٠
ئەنفال دڕندەترین کردەوەی سەربازی وکۆمەڵکوژی حکومەتی بەعس بوو، کەلەساڵی ١٩٨٨
ئەنجامی دا ، کەتیایدا (٤٥٠٠) چوارهەزاروپێنجصەد گوندی ڕووخاندونزیکەی چارەگەملیۆ
نێك مرۆڤی کوردی بێسەروشوێن کرد٠

(ن) ئافرەتێکە دەڵێ : ((عەسکەرەکان وەك سەگی هارکەوتنە ناومان هەرچی زەلام بوو جیا یان کردەوە ، منداڵ هەبوو شەرواڵەکەی باوکی دەگرت و بەری نەدەدا عەسکەرەکان پاڵیان پێوەدەنا وئەیان خست یان بەشەق وقۆناغە تفەنگ دەکەوتنە گیانی ئەوەی جیانەبووایەوە تەنیا گریانیان لەدەست دەهات بەبەرچاوی خۆمان زەلامەکانیان سواری سەیارە دەکرد، منداڵ هەبوو باوەباوەی ئەوناوەی پڕکردبوو کەبردنیان ئاوڕیان لێ ئەدایەوە هەردوولامان چاومان ئێمەشیان بەئیڤای عەسکەری گواستەوە))٠

(ئە) دەڵێ : ((بەبەرچاوی دایك وباوکەوە بەکێبڵ لەگەنجەکانیان دەدا کۆستەرومونشەئەو دنیایەك سەیارەیان دەهێنا کەوتنە بارکردنی خەڵك لەناوسەیارە منداڵ کەوتبووە هات وهاوار ، یەکێ دەیووت برسیمە ، یەکێ هاواری دەکرد میزم دێ ، ئەوکەسانەی بەچاوی خۆیان بینیویانە دەزانن چ برینێکە خەڵك ئەگەرجوجەلەیەکی بزربێ چاوی بۆدەگێڕێ ئەی ئەگەرجەرگەکەت بەرن ولێتی بشارنەوە دەبێ چ ئازارێکی هەبێ ، کچەکانمان ، کوڕەکانمان ، بووك وکوڕەزاکانم هەموویان ڕۆژانە دەکەونە پێش چاوم کەچۆن لەیەکترجیاکراینەوە٠ کەگەنجەکانیان باردەکرد لەپشتەوە دەستیان بەپشتێن یان جامانەکەی خۆیان دەبەستەوە و زۆریشیان چاویان دەبەستن))٠

(م) دەڵێ : ((حکومەت بەتۆپ و تەیارە لەگوندەکانی دەدا دەستی لەکەس نەدەپاراست چەند جارکۆپتەرتەقەی لەمەڕومالآت دەکرد ، شوانی دەکوشت ، ئاژەڵی دەکوشت ، سەیارە لە ڕێگاوبانەکان هاتووچۆی بکردبا لێی ئەدا))٠

(ع) دەڵێ : ((صدام لەنێومندالآنی کورد وێنەی دەگرت وبڕیاری بەکۆمەڵ کوشتن و زیندە بەچاڵکردنی هەزاران منداڵی شیرەخۆرەی ئەدا و لەکەناڵەکانی ڕاگەیاندنیش دا لەئامێزی دەگرتن))٠

(س) ئافرەتێکە هەمووخێزانەکەی بەرپرۆسەی ئەنفال کەوتوون ، دەڵێ : ((من دوامنداڵی خێزانەکەمان بووم تەمەنم هێشتا دەساڵی تەواونەکردبوو ئەنفالچییەکان خۆم و هەموو خێزانەکەمیان گرت و ڕەوانەی (سمود)یان کردین لەوێ پیاوەکانیان لێ جیاکردینەوە باوکم وسێ برای منیشیان برد تائێستاش چارەنووسیان دیارنییە ، کەنازانین تەرمەکانیان لەکام گۆڕی بەکۆمەڵە ، ئەوەجگەلەوەی کەکچان و ژنانی گەنج دەستدرێژییان دەکرایە

سەروهەندێکیان خۆیان دەکوشت٠بەڕاستی برین و ئازارەکانی ئەنفال تاکۆتایی ژیانمان نابڕێتەوە ، من ودایك و خوشکێکم بەتەنیا ماینەوە و سەرپەرشتی خێزانمان نەمابوو ناچاربووین خۆمان نانی خۆمان پەیدابکەین ، ژیانێکی زۆرناخۆشمان هەبوولەخوێندن دابڕابووین وەك کوڕان کارمان دەکرد٠

**ئەخلاقی مرۆڤ :**

**بەپێی فەرهەنگی (گود) ئەخلاق بریتییە لەجوولانەوەوهەڵسووکەوت کردن بەپێی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی٠(مانای وانییە کەتاك بەبێ گوێدانە باش وخراپ ، کوێرانە گوێڕایەڵی داب و نەریت و بەهای کۆمەڵەکەی بێت بەهیچ جۆرێك لێیان لانەدات)٠**

**درودی خوای لەسەربێ ، فەرموویەتی :** ((انما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق))

**ڕاستە دیاردەی خراپە لەناوعەرەب دا باوبووە ، بەڵام ئەم حەدیسە بەڵگەیە لەسەرئەوەی عەرەب لەپێش ئیسلام دا خاوەنی هەندێك بەهای ئەخلاقی جوان بوون وەك : میوانداری وبەخشندەیی و٠٠٠هتد٠بۆنموونە ئیبن کەسیرلە (البدایە والنهایە) ، دەڵێ : پرسیارکرا لە حاتەمی تائی لەناوعەرەب دا کەس لەتۆ بەخشندەترهەیە ؟ وتی : هەموو عەرەب لەمن بەخشندەترن٠شەوێکیان بوومە میوانی گەنجێك ئەوگەنجە خاوەنی (١٠٠) سەد مەڕبوو ، مەڕێکی بۆسەربڕیم کاتێك خستییە بەردەمم گوتم ئەم کەللە سەروموخە چەند بەتامە گەنجەکە بەبەردەوامی بۆی دەهێنام دواترزانیم هەرمەڕی تری سەردەبڕی٠**

**نموونەیەکی تر :**

**سەعسەعە ناسناوی زیندووکەرەوەی زیندەبەچاڵکەرانی پێدراوە ، جارێکیان بەلای پیاوێ دا تێپەڕی بینی سەرقاڵی هەڵکەندنی بیرێکە ، هاوسەرەکەشی لەولاوە دەگری ، سەعسەعە بەپیاوەکەی وت : بۆچی ئەم کارە دەکەی ؟ لەبەرهەژاری ؟ زیندە بەچاڵ مەکە دوو وشتر ت دەدەمێ کابرا ڕازی بوو زیندە بەچاڵی نەکرد، تائەوکاتەی ئیسلام هات ، سەعسەعە فید یەی (٣٠٠) سێصەد کچی دابوو٠**

**فەیلەسوفی ئەڵمانی شۆپنهاوەر ، دەڵێ : ((بنەمای ئەخلاق بریتی یە لەبەزەیی نەك هەر بەرامبەربەرەگەزی خۆت ، بەڵکو بەرامبەربەهەمووگیانداران))٠چونکە ئاژەڵانیش وەکو مرۆڤ بەرێگادادەڕۆن ، بەدوای خواردن دا عەودالن ، شیردەدەنە بەچکەکانیان ، پارێزگار یيان لێدەکەن ، یاری دەکەن ، پێکداهەڵدەشاخێن ، هەست بەئازاردەکەن و هاواردەکەن ، لەدایك دەبن ودەمرن٠هەروەها تایبەتمەندی دیکەش هاوبەشە لەنێوان مرۆڤ و ئاژەڵ دا کەئاژەڵانیش هەیانە وەکو سەگ لەوەفاداری دا ، مێروولە لەماڵداری دا٠سەگیش لەوەفاد**

اری لەمرۆڤ زیاتری هەیە ، ئاژەڵ خۆشەویستی بۆبەچکەکەی پیشان دەدات وتوڕەدەبێ و
، بەچکە سەگ یان پشیلە پێکەوە یاری دەکەن ، پێکدا هەڵدەشاخێن٠خوای گەورە دەفەر
موێ :{وما من دابة في الأرض ولاطائر يطيربجناحيه الا أمم أمثالكم}الأنعام : ٣٨
واتا : (هیچ گیانلەبەرێك نییە لەسەرزەوی دا ، هیچ باڵندەیەکی باڵەفڕیش نییە ئیللاوە
ك ئێوە میللەتێکن)٠

"ویلیام هارس" ، ئەم ڕاوچییە لەگەشتنامەکەی خۆی دا دەنووسێت : ((کاتێك بۆیەکەم
جاردایکانە فیلێکم کوشت ڕۆژی دواتر چوومەوە لای لاشەی فیلەکە ، سەیرم کرد هەموو
فیلەکان لەوناوە ڕایانکردووە تەنها بەچکە فیلەکە نەبێت کەهەموو ئەوشەوەی لەتەك د
ایکی خۆی بەسەربردووە٠هەرکە چاوی بەئێمەکەوت لەکاتێکدا ترسی لەبیرکردبوو بەڕا
کردنەوە بۆلای ئێمە هات خەمێکی جەرگبڕبەسیماوحالەتییەوە دیاربووخەرتووم (لووت)
ی خۆی بۆلایەك بەرزکردەوە وەك ئەوەی داوای کۆمەك و بەهاناوەهاتنمان لێ بکات ، دە
نووزایەوە))٠

لەڕەوشتە جوانەکان ڕێزگرتنە لەبەساڵاچووان ، لەکاتی بەیەکگەیشتن دەبێ گچکەکان دە
ست پێشخەربن بۆسڵاوکردن لەگەورەکان ، لەم بارەیەوە پێخەمبەر (درودی خوای لەسەر
بێ) فەرموویەتی : ((ويسلم الصغيرعلى الكبير)) ، هەروەها لەکاتی نوێژی بەکۆمەڵدا ئەوە
ی لەهەموویان بەتەمەنترە ئەوپێشدەخرێت بۆپێشنوێژ ، لەم بارەیەوە درودی خوای لەسە
ربێ فەرموویەتی : ((فاءذا حضرت الصلاة فليؤذن لكم أحدكم وليؤمكم كبيركم))
واتا : ((هەرکاتێك نوێژهات ، بایەکێکتان بانگ بدات و کامەشیان لەهەموویان بەتەمەنترە
وگەورەترە ئەوەیان بۆپێش نوێژپێش بکەوێت))٠

لەڕەوشتە ناشیرینەکان دیاردەی نووسین لەسەردیواری قوتابخانەکان یان ئاودەستی مزگەو
تەکان دەنوسرێت٠ئەوەش هەرزەکارانەیە نووسین لەسەردیوی دەرەوەی ئۆتۆمبێلەکان یاخو
دعەرەبانە و ماتۆڕ وەك : (تاکەی بێژن بم!) ، ( خۆشم دەوێی هەناسەکەم لە قاپ شووشتن
هەتازەلام کوشتن لەگەڵتام!) ، ٠٠٠تاد٠ لەوانەیە ئۆتۆمبێلەکەی پشتی بیخوێنێتەوە بەوەش
ڕووداوی هاتووچۆ ڕووبدات٠ئەم دیاردەیەش زیاترپەیوەندی بەدواکەوتوویی کۆمەڵایەتییە
وە هەیە ، کەزیاترشوفێری هەرزەکار ئەم جۆرە شتانە دەنووسێت٠

**لەڕەوشتە جوانەکان بەهاناوەچوونی لێقەوماوانە ، درودی خوای لەسەربێ دەفەرموویت :**
((ان الله يحب اغاثة اللهفان)) رواه الطبراني• **واتا : ((خواچوون بەدەنگ لێقەوماوانی پێخۆشە))•**

**هەروەها بەکارهێنانی ڕەوشت لەگەڵ فەرمانبەر بەدانانی لەشوێنی شیاووپاراستنی کەسایە تیان ، ئەگەرهاتوو فەرمانبەر لەشوێنی شیاو دانەنرا ئەوا زیان بەکەسایەتی دەگەیەنیت و ڕێزگرتنی کەم دەکاتەوە ، کەسێك کە هەڵگری بڕوانامەی بەکالۆریۆسە دانانی لەپرسگە ، کەسێکیش کە دەچووی سەرەتایی یان ناوەندییە کردنی بەفەرمانبەرێکی موهیم بەبێ لە بەرچاوگرتنی بڕوانامەی خوێندن•••ئەگەرفەرمانبەرێك کەمتەرخەم بێ لەئەرکەکەی دە بێ ئاگاداربکرێتەوە لەوکردەوەیەی ئەنجامی داوە وداوای لێ بکرێت جێ بەجێ کردنی ئەر کەکەی خۆی چاك بکات بەشێوەی ئامۆژگاری یان سەرزەنشت بکرێ ڕووبەڕوو نەك لەپا شملە جێ بەجێکردنی سزا لەسەرفەرمانبەر و کەمکردنەوەی ڕێزی و داگرتنی پلەی کۆمە لأیەتی بەبێ ئاگادارکردنەوەی فەرمانبەرلەوسستییەی ئەنجامی داوەگواستنەوەی بۆپرسگە ، ئەوە بەسەرهاتێکی خۆمە•**

**لەڕەوشتەجوانەکان ئەوەیە بەنەرمی هەڵسووکەوت لەگەڵ یەتیم بکەین ، خوای گەورە دە فەرموێ :** {أرأيت الذي يكذب بالدين} **ئەرێ ئەبينيت ئەوەی کەباوەڕی بەڕۆژی سزانییە؟**
{فذلك الذي يدع اليتيم} **ئەوکەسەیە کەبەتوندوتیژی ، بەزبری هەڵسووکەوت لەگەڵ یەتیم دەکات•**

**تێبینی :**

**درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی : ((لایتم بعد احتلام)) واتا : ((دوای بالغبوون یەتیم نامینێت))•**

{ولايحض على طعام المسكين} **(کەسیش هان نادا بۆئەوەی خۆراکێ بدا بەهەژارێ) هەر کەس ئەوسیفەتانەی هەبێ ئەهلی بەزەیی و میهرەبانی نییە ئەوە ئیتر درۆدەکات بابڵێ مو سوڵمانم ، ئەگەرنوێژیش بکات درۆدەکات•**

{فويل للمصلين} **وای بۆئەونوێژکارانەی ئەوکارە دەکەن•**

{الذين هم عن صلاتهم ساهون} **ئەوانەی نوێژدەکەن بەلأم لەحەقیقەت وڕوحی نوێژە**

که غافلن (هەمووکەسێك سەهوو دەکات لێرە بەمانای سەهوونەهاتووە)٠نوێژەکەیان ڕوحی نییە تەنها ڕواڵەتی یەوزاهیری یە٠

{الذين هم يراؤون} ئەوانە ڕیادەکەن ، خۆدەنوێنن هەدەفیان ئەوەیە خۆیان بەنوێژکاربنا سێنن خەڵك بلێت نوێژدەکەن ، خەڵك هەڵدەخەڵە تێنن نوێژەکەیان بۆئەوەنییە بەڕاستی بەندایەتی خوا بکەن ، چونکە ئەگەروابوایە ئاوا لەگەڵ یەتیمان ڕەفتاریان نەدەکرد ، سوکا یەتییان پێ نەدەکردن ، دڵیان نەدەڕەنجاندن ، هەروەها بەزەییان بەهەژاران دەهاتەوە بۆ یەتەنیاهەدەفیان ئەوەیە خەڵك بەنوێژکەریان بناسن٠لەزەمانی هەموو پێخەمبەرەکاندا نو یژواجب بووە ئیترلەهەرزەمانێکدا چۆن بووە ئەوە گرینگ نییە ، خوای تەعالا دەفەرموێ :

{ان الصلاة تنهى عن الفحشاء والمنكر} واتا :(نوێژئینسان مەنع دەکات لەشتی ناپەسند) بەلاّم نوێژێك حەقیقەت وڕۆحی هەبێت نەك ڕواڵەتی وزاهیری بێت٠یەکێك لەسەربازە دید ەوانییەکانی سوپای ساسانی پێش جەنگی قادسیەکاتێك سەربازە موسوڵمانەکانی بینی ڕێك وەستابوون لەڕیزەکانی دا بۆنوێژی بەیانی بەسەرکردەکەی وت : بڕوانە سوپای موسوڵمانان خەریکی مەشقکردنی سەربازی ڕۆژانەن٠

نوێژکردن لەدوای باوەڕهێنان بەخودا و پێخەمبەرەکەی یەکێکە لەڕوکنە هەرەگرینگەکانی ئیسلام ، پێنج ڕوکنەکەی ئیسلام کەبریتین لە : -

١ – باوەڕهێنان بەتاك و تەنیایی خواو بەپێخەمبەرایەتی موحوممەد (درودی خوای لەسەر بێ)٠

٢ – نوێژکردن٠

٣ – زەکاتدان٠

٤ – ڕۆژووگرتنی مانگی ڕەمەزان٠

٥ – حەجکردن٠

دەرکەوتووە کەباوەڕداری پەیوەندییەکی پتەوی بەڕەوشتبەرزییەوە هەیە ، (هارتشۆن) ڕای گەیاندووە ، کەڕێژەی قۆپیەکردن لەناوئەوەمنداڵانەی کە هاتووچۆی کلێسادەکەن کەمترە ئە وەبۆکلێسا بۆمزگەوتیش ڕاستە٠

**لەڕەوشتە جوانەکانی مرۆڤ زۆرسوێندنەخواردنە : {ولاتطع کل حلاف مهین} واتا ئەوکە سەی زۆرسوێنددەخوات ، چونکە زۆرسوێندخواردن نیشانەی لاوازی کەسایەتییە ، لەبەر ئەوەی خەڵك بڕوای پێناکات.**
{لایؤاخذکم الله باللغوفي أیمانکم ولکن یؤاخذکم بما کسبت قلوبکم والله غفوررحیم} البقرة : ٢٢٥
**واتا : (خوابەسوێندی سەرزارەکی گوناهتان لەسەرنانووسێ ، بەڵام ئەگەرلەهی دڵتان بێت خودا لێتان دەپرسێتەوە ، خودا لێبوردەیە).**
**لەئیسلام دا چەندین جۆری سوێند هەیە ، کەجۆرێکیان سوێندی درۆیە گوناهەکەی زۆرگە ورەیەوکەفارەتیشی نییە ، بەڵام ئەوسوێندەی کەبۆئایندە دەخورێت دوایی خاوەنەکەی وادە زانێت بیشکێنێت باشە ئەمەیان کەفارەتی دەدرێت ، بەڵام ئەوجۆرە سوێندەی کەمرۆڤ زما نی لەسەری ڕاهاتووە لەئیسلامدا حیسابی لەسەرناکرێت وخاوەنەکەی پێی گوناهبارنابێت. بۆنموونە جارێکیان پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) چەند هاوەڵێکی لەگەڵ دەبێ بە لای خەڵکی دا تێپەڕدەبن ، کەنیشانە شکێنییان دەکرد ، یەکێکیان تیرەکەی هاویشت وتی : بەخواپێکام ، بەڵام نەی پێکابوو ، هاوەڵێکی پێخەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ)وتی : ئە ی پێخەمبەری خوا سوێندەکەی کەوت ، ئەویش فەرمووی : سوێندی نیشانە شکێنان لەغوە وکەفارەتی نییە.(ئەم جۆرە سوێندانەش بێ مەبەستی درۆکردنە)**
{همازمشاء بنمیم} **واتا قسەی ئەم دەبات بۆئەوو قسەی ئەم دێنێت بۆئەو بۆئەوەی بە ینیان تێکبدات.**
{مناع للخیر} **مەنع ئەکا خێربگاتە دەستی ئەوانەی کە موحتاجن.**
{معتد أثیم} {عتل بعد ذلك زنیم} **ناصری سوبحانی دەڵێ : (زنیم) یانی لەخەڵك نییە. لەزمانی کوردیش (زۆڵ) ئیدیەمە واتا کەسێکی زۆرزان و زیرەك و فێڵباز و ناپاك.**

**ژیان :**

**ژیان ، ژین ، زیندەگی ، لەیەکەم ساتی لەدایکبوون تاکو مردن٠**

**درودی خوای لەسەربێ فەرموویەتی :** ((الدنيا مزرعة الأخرة))

**واتا : ((دنیا کێلگەی ڕۆژی دواییە))٠(نەك ژیان بۆژیان)**

**شاعیردەڵێ :**

**زندگی جنگ است جانا بهر جنگ اماده شو**

**واتا : ژیان واتا شەڕ بۆئەو شەڕە ئامادە بە**

**شاعیر دەڵێ :**

دقات المرء قائلة له – أن الحياة دقائق وثوان
فارفع لنفسك قبل موتك ذكرها – فالذكر للأنسان عمرثان

**واتا : لێدانەکانی دڵی مرۆڤ پێی دەڵێن – کەژیان خولەك وچرکەیە**

**پێش مردن زیکربکە – چونکە زیکربۆمرۆڤ وەك ژیانێکی تروایە**

**ئیبن و عەبباس فەرموودەیەکی لەپێخەمبەری خوا (درودی خوای لەسەربێ) دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی : (( تۆدەیبنی یەکێ لەبازاڕدەگەڕێت ودێت ودەچێ ، لەولاشەوە ناوی لە لیستی مردووەکانی ئەوساڵ دا تۆمارکراوە))٠**

**خواجە محەممەد ئیسلامی پاکستانی لەکتێبەکەیدا : ((دیمەنی مەرگ)) ، کەشێخ عەزیز شێخ صدیق شێخ ئەحمەدی کەسنەزانی وەریگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی ، دەڵێ : ((چۆن هەمووڕۆژێ پلانی کاری ڕۆژێکی تریان داناوە ، هەموو ساڵێ پلانی ساڵێکی تریان داناوە کەچی نەیان دەزانی ئەمشەو یان ئەمڕۆ دواشەو یان دواڕۆژیانە لەجیهان٠ ئێمەش وەکو ئەوان سەرقاڵ و سەرگەرمی ژیانی دنیاین نازانین بەیانی چیمان بەسەردێ))٠**

**أحمد بن محمد مسکویە لەکتێبی** (تهذيب الأخلاق) **دەڵێ : ((ئەگەرئەوانەی پێش ئێمە نە مردبوونایە ئەوکاتە شوێنی خانووبەرەش نەدەما ، کشتووکاڵ نەدەما ، جوولە نەدەما))٠ ئەگەرمردن نەبوایە دەبوایە بیریان لەلەناوچوونی خەڵکانێك کردباوە بۆخاتری خەڵکانێکی تر٠(ئیبن جەوزی) دەڵێ : ((پێویستە لەسەرئەوکەسەی کەنازانێ چ کاتێك مردن بەرۆکی د ەگرێ دەبێت لەئامادەباشی دابێت وهەڵنەخەڵەتان بەهۆی گەنجایەتی و لەشساغی ، چونکە بەڕاستی کەمتڕن ئەوانەی کەدەمرن بەهۆی بەساڵاچوون وتەمەنیان))٠**

**سەرکەوتن لەژیان دا :**

**ژیان بریتییە لەخۆشی و ناخۆشی٠(ئەفلاتون)**

**زانای دەروونناسی بەناوبانگ (جان بیاجی) ، دەڵێ : ((کێشەوململانێکان بەشێکن لەسرو شتی ژیان))٠**

**عەلی وەردی دەڵێ : ((زۆربەی شکستخواردووەکان لەژیان دا بەرپرس نین لەشکستەکانیان ، دەتوانین ئەم پێوانەیە بەبالأی سەرکەوتووان دابڕین تواناوبەهرە ڕۆڵیان هەیە لەسەر کەوتن یان شکستی کەسەکان ، هەروەها ئەوباروداوخەی کەمرۆڤ پێی دا تێپەڕدەبێت ، هە روەها هەل (فرسەت) لەژیاندا کاریگەری لەسەرکەوتنی کەسەکان هەیە))٠ هەروەها دەڵێ : ((سەرکەوتن لەژیان دا زۆرهۆکاری هەن ، گرینگەکەیان هەبوونی بەهرەیە دواتربارودۆ خی لەبارورێکەوتی باش یاریدەدەرن بۆئەومەبەستە))٠هەروەها دەڵێ : ((جارێکیان هەند ێ منداڵم بینی کرێکارییان دەکرد لەژێرگەرمای هاویندا ، ئەمانە لەبەرهەژاری نەیان توا نیبوو بچنە قوتابخانە ئەمە هیچ سووچ وتاوانێکی ئەوانی تیانییە ، کەبۆیان نەلواوە وەکو منداڵانی خواپێداو بچنەقوتابخانە، بەڵکوبوونەتە قوربانی ئەوباروداوخەی تیایدا لەدایکبو ون٠بۆیە هەندێك سەرکەوتوو تووشی لووتبەرزی و لەخۆبایی بوون دەبێت ئەوسەرکەوتنە ی دەگەڕێنێتەوە بۆهەوڵی زۆروئیرادەی خۆی٠بەڵام لەواقعدا چەندهۆکارێکی ترهەن سەرە ڕای ئەوهۆکارانە بۆگەیشتن بەسەرکەوتن٠ئەگەربێتوو ئێمە ئامارێك لەنێوان ژمارەی ئەو انەی ویستوویانە سەکەوتن بەدەست بهێنن بەڵام پێی نەگەیشتوون و ئەوانەی واسەرکەو تنیان بەدەست هێناوە ئەوادەبینی ژمارەی ئەوانەی نەگەیشتوونەتە سەرکەوتن زۆرزیاترە لەژمارەی ئەوانەی واپێی گەیشتوون))٠هەروەها دەڵێ : ((ناپلیۆن لەجەنگی (واترلۆ)دائەو بارانەی دەباری بووە هۆی دواخستنی گوێزانەوەی تۆپەکان ، بووە هۆی ئەوتێکشکانەی بە سەری هات))٠**

**(سمیلز) دەڵێ : ناپلیۆن زۆرزیرەك و بیرتیژبوو سەیری هەرپیاوێکی بکردبایە یەکسەرخوو ڕەوشت وهەڵسووکەوتی دەزانی ، لەبەرئەوە زۆربەکەمی دەکەوتە هەڵەوە لەدەست نیشانکر دنی پیاوەکانی٠عەلی وەردی دەڵێ :  لێرەدا دەمانەوێ پرسیارێك لەو نووسەرە (سمیلز) بکە ین : ئایا ئەوبیرتیژییەی ناپلیۆن کەناوبانگی پێ دەرکردبوو بووبووە هۆی سەرکەوتنەکانی**

ئایائەوبیرتیژییەو زیرەکییەی ناپلیۆن بەرەنجامی کۆششەکانی ناپلیۆنە یان هەربەخۆڕسك وبەشێوازێکی سروشتی تێیدا هەبووە ؟ هەروەها عەلی وەردی دەڵێ : بۆنموونە یەکێك دەیە وێ قسەخۆش بێ کاتێك دەبینێ کەسانێکی تر خاوەن قسەی خۆش و نوکتە و ئەمانەن کە سانی دەوروبەریان دەخەنە پێکەنین ئەمیش دەیەوێت لاساییان بکاتەوە خۆی خەریك دە کات نوکتە لەبەردەکات ، بەلاّم بەپێچەوانەوە بەگەوج و گەلحۆ دەناسرێت لەناوخەڵکی دا٠

(گ) دەڵێ : ((سەرکەوتن لەژیان دا بەبەختەوهیچ پەیوەندی بەزانایی وزیرەکییەوە نییە ، چونکە زۆرکەس بەبێ ئەوەی خاوەن بەهرەوتایبەتمەندی بن دەگەنە پلەی بەرز))٠

(ف) دەڵێ : ((سەرکەوتن لەژیان دا بەدانایی و زیرەکییە٠ئەگەرمرۆڤ لەژیان دا بەدانایی و زیرەکی مامەڵە بکات دەتوانێ بەسەرهەموو گیروگرفتەکان زاڵ بێ ولەژیان دا سەرکەوێ))

(ش) دەڵێ : ((مەسەلەکە ڕێژەییە ، لەبەرئەوەی زۆرجاروابووە بەخت ڕۆڵی سەرەکی گێڕ اوە لەمەسەلەیەکی گرینگ دا ، بەلاّم جاری واش هەبووە زانایی وزیرەکی ڕۆڵی هەبووە٠لە ژیانی خۆم دا بڕوام بەبەخت هەیە زۆرجاربەخت ڕۆڵی هەیە لەژیان دا))٠

گیروگرفت وناخۆشییەکان داب ونەریتی ژیانن ، خوای گەورە فەرموویەتی : {لقدخلقناالأ نسان في كبد} وشەی (کبد) لێرەدابەمانای دەردەسەری وئێش و ئازارچەشتنە (کبد) وا تا جگەر و جگەرهێشان ، ئێش و ئازاری جگەر ، سك هەڵئاوسان ، نارەحەتی٠

تێبینی دەربارەی وشەی (کبد – جگەر) وتایبەتمەندی زمانی عەرەبی و قورئان : -

١ – لەزمانی عەرەبی دا وشەهەیە چەندین واتای هەیە٠

٢ – هەندێك جاروشەیەك دوو واتای دژبەیەك دەبەخشێت٠

٣ – بوونی وشەی جیابۆیەك واتا (هاوواتا) بۆنموونە حوشترچەندین ناوی هەیە٠

٤ – هەندێ جارکرداری ڕابردوو دەهێنرێ مەبەست پێی ڕانەبردووە ، هەندێ جاریش ڕا بردوو دەهێنرێ مەبەست پێی ڕابردوو و ئێستا وداهاتووە٠

٥ – هەندێ جارباس لەتاك دەکرێ مەبەست پێی کۆیە ، هەندێ جاریش باس لەکۆدەکرێ مەبەست پێی تاکە٠

٦ – هەروەها دەکرێ قسەهەیە دەکرێ بۆکینایە بەکارهاتبێ٠

"ئەنتۆنی ڕۆبینز"دەڵێ : ((بەمنداڵی چەندجارکەوتووی بەئەرزا تابەسەرپێ کەوتووی ؟ بێگومان زۆر ، ئەگەرلەگەورەییش دا ئەوە بکەی سەرکەوتن مسۆگەرە))٠ڕۆژێك لەپیاوێکی گوندنشین دەپرسن : مانگاکەتان چەند شیردەدات ؟ ئەویش دەڵێ : مانگاکە شیرنادات دەبێ خۆمان لەگوانییەوە دەری بێنین٠ژیانیش هەروایە دەبێ خۆمان کۆشش بکەین٠خوای گەور ە دەفەرموێ : {وتلك الأيام نداولها بين الناس} واتا : (ئەوە ڕۆژگارە ئێمە ئاڵ و گۆڕی پێ دەکەین لەنێوان خەڵکی دا)٠

(خ) دەڵێ : (( شکست بریتییە لەبەدەست نەهێنانی ئامانج٠هەرکەسێك لەژیاندا هۆکاری تا یبەتی هەیە بۆشکست هێنانی نابێ شتێك تۆڕابگرێت لەژیان ، زۆرگرینگە لەژیاندا هەرگیز کۆڵنەدەیت بەرامبەربەشکستەکانت ، شکستهێنانی تۆلەبوارێکی ژیان مانای ئەوەنییە تۆبێ توانای، باوەڕت هەبێت شکست ئەزموونداریت دەکات ، شکست وسەرکەوتن سروشتی ژیانە)) هەروەها دەڵێ : ((یەکێك لەهۆکارەکانی شکست هەوڵنەدانە بۆئامانجەکانت ، ئەگەرتۆ ئاما نجێکی گەورەت هەبێت ، بەڵام هیچ هەوڵێکی بۆنەدەیت وەك ئەوەیە تۆبڵێیت دەبێت بگەم بەلوتکەی چیاکە ئامانجەکەت داناوە ، بەڵام بەسەرچیاکە سەرنەکەویت هەرلەخوارەوە دە مینێیتەوە کاتێك تۆهەوڵت دا بۆسەرچیاکە لەگەڵ ئەوەی ماندوو دەبی یاخود بەردەبییە وە لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە هەوڵ بدەیت و بێزارنەبیت بۆگەیشتن بەسەرچیاکە ، ناشبێ تۆئامانجێك دابنێی لەخۆت گەورەتربێت بۆنموونە جوتیارێك بڵێ من دەبم بەوەزیر ، بە ڵکودەبێت بڵێی دەبێت بەرووبوومی ئەمساڵم باشتربێت لەپار، گرینگە مرۆڤ لەوپێگەیەی تێی دایە هەوڵی باشتربوونی بۆبدات))٠هەروەها دەڵێ : ((ژیان هەمووکات بەدڵی تۆنابێ ، تۆئەگەربتەوێ خەونی ناخۆش نەبینی دەبێت نەخەوی))٠

زانیاری گشتی :

⋆سەمفۆنی : بریتییە لەوپارچە مۆسیقایەی کە ئۆرکیسترا لێی دەدات٠

⋆گۆرانی (هۆب زەندان)

ئاوازی : فۆلکلۆر

ئامادەکردن وزیادکردنی کۆپلە : وریا ئەحمەد

گوتنی : ڤیان فایەق

لەساڵی (١٩٨٣) لەلایەن تیپی خانزادی کچان بۆتەلەفزیۆنی کەرکووك تۆمارکراوە٠

هۆب زەندان و هۆب زەندان

هۆب زەندان بازی بەندان

پیرۆزبێ خەنە بەندان

هۆب زەندان و هۆب زەندان

هۆزەیۆکاگول گولی

پیرۆزبێ بازی بەندان

کەسك و سووروخەمای

هۆب زەندان بازی بەندان

بسکی وی لەسەرمای

هۆب زەندان بازی بەندان

بازنی زەندی جووتن

هۆب زەندان بازی بەندان

بازنێ زەریێ سێنە

هۆب زەندان بازی بەندان

بازنی زەریێ چارن

هۆب زەندان بازی بەندان

⋆كۆنفۆشیۆس :

كەسایەتییەكی بەناوبانگی(چین)ەلەساڵی (٥٥١)پ م لەدایكبووە٠كۆنفۆشیۆس وشەیەكی لێكد راوەلەدوو كەرت پێكهاتووە : كونج ناوی خێڵەكەیەتی ، فۆیتس واتاسەرۆك یان فەیلەسووف لەتەمەنی سێ ساڵی دابوو باوكی مرد ، مردنی دایكیشی كاریگەری زۆری بەسەركۆنفۆشیۆ سەوە بەجێهێشت بەڕاددەیەكی زۆرگۆشەگیری كرد بۆماوەیەك بەتەنیا ژیا٠لەم ماوەیەدا هە رچی كتێبی فەلسەفی بیریارانی چینی هەبووخوێندییەوە ، پتشماوەیەك قوتابخانەیەكی فە فەلسەفی دامەزراند و ژمارەی قوتابییەكانی زۆربوون و چەند پۆستێكی حكوومی وەرگرت لەوانە : ڕاوێژكاری میرەكان و كاربەدەستان وچەند پۆستێكی دیكە٠لەساڵی (٤٧٩)پ م كۆچی دوایی كرد٠كۆنفۆشیۆس هیچ كاتێك داوای لەخەڵك نەكردووە بیپەرستن و هیچ كاتێكیش نەیوتووە من پێخەمبەرم ، بەڵكوبیروباوەڕی فەلسەفی پێشكەش كرد بۆیە كۆنفۆشیۆس فە لسەفەكەی پێكهاتووە لەكۆمەڵێك پەندوقسەی نەستەق قوتابییەكانی كۆیان كردۆتەوە و بە دوای فەلسەفەی كۆنفۆشیۆس كەوتن لەچین ، كۆنفۆشیۆسییەكان لەچین و یابان و كۆریاو تایوان و ڤێتنام و سەنگافوورە بوونیان هەیە٠(ئەوزانیارییانەم لەبابەتێكی مامۆستا كابان عەبدولكەریم شێخ عەلی وەرگرتووە ، كەلەگۆڤاری هەرێمی كوردستان ژمارە ٥٣١ ی ساڵی ٢٠٠٩ بلاْویكردۆتەوە)

⋆سایكۆدراما :

یەكەم كەس ئەوزاراوەیەی بەكارهێنا زانایەك بوو بەناوی (مۆرینۆ) ، زاراوەی سایكۆدراما لەدوو وشە پێكهاتووە سایكۆ بەمانای دەروونی و دراما بەمانای تەمسیلی ، كەبەمانای نما یشی دەروونی یان یاریكردنی ڕۆڵ دەگەیەنێت٠

⋆لەزمانی عەرەبی دا وشەی (انتحار) لە وشەی (النحر) داتاشراوە كەبەمانای سەربڕینی ئا ژەڵ دێت٠

⋆ئیبراهیم فەقێ :

ئەم نووسەرە ساڵی (١٩٥٠)لەئەسكەندەرییەی میصرلەدایكبووە ، لەساڵی (٢٠١٢) لەتەمەنی (٦٢)ساڵی دا كۆچی دوایی كرد٠ژمارەیەك كتێبی هەیەوەرگێڕدراوەتە سەرزمانی كوردی و عەرەبی و ئینگلیزی و فەڕەنسی ، لەوانە : هونەری پەیوەندی بێ سنوور ، (١٠)دەكلیل بۆ

سەرکەوتن و ۰۰۰هتد۰

★(۱)ی حوزەیران :

ڕۆژی جیهانی مندالأن۰(هـ س) ئەومنداڵەیە لەیەك کاتدا کاردەکات و دەشخوێنێ ، دەڵێ : لە پۆلی پێنجەم دەخوێنم من لەوەرزی خوێندن کاردەکەم ، چونکە باوکم لەژیاندا نەماوە وبرا ی گەورەم نییە تەنیاخوشکێکی گەورەم هەیە لەگەڵ دایکم نان بۆخەڵکی بەکرێ دەکەن۰

(د) تەمەنی (۵)ساڵە ، دەڵێ : من دایکم وباوکم لێکجیابوونەتەوە منیش ئێستالای داپیرم دە ژیم داپیرم بەگریان دەم نێرێتە بەرکارکردن، ڕۆژانە منداڵەکانی ئەوشەقامە ئازارم دەدەن۰

(ك ع) پۆلی دووەمی سەرەتاییە و دەرچووە و بۆتە پۆلی سێ کرێمستی دەفرۆشێ ، دەڵێ : من تەنیالەتەلەفزیۆن دەزانم جەژنی مندالأن چییە وابزانم ئەوڕۆژە تەنیا جەژنی منداڵە دەوڵەمەندەکانە بۆخۆیان لەئاهەنگەکان بەشداردەبن۰

★ژیانی ناوگۆڕ :

مەبەست لەژیانی ناوگۆڕئەوەنییە کەهەرلەناوگۆڕدابیت ، بەڵکوئەوژیانەیە ، کەلەمردنەوە دەستپێدەکات ، تا کاتی قیامەت ئیتربخرێتە ناوگۆڕیان نا۰{ومن ورائهم برزخ الى يوم يبعثون} المؤمنون : ۱۰۰

واتا : ( تاڕۆژی قیامەت لەمپەروبەربەستێکی زۆرگەورە لەپێشدایە)۰ گەلێك فەرموودە لە پێخەمبەری خواوە (درودی خوای لەسەربێ) دەربارەی سزای ناوگۆڕهاتووە بۆنموونە ئەم فەرموودەیە : ((اللهم اني أعوذبك من عذاب جهنم وأعوذبك من عذاب القبر۰۰۰الى اخرالحديث))۰ رواه البخاری ومسلم وغيرهم۰هەروەها ئەم فەرموودەیە : ((القبررو ضة من رياض الجنة أوحفرمن حفرالنار)) واتا : ((گۆڕ یان باخچەیەکە لەباخچەکانی بەهەشت یان چاڵێکە لەچاڵەکانی دۆزەخ))۰

★وشەی (فەرمان) بۆهێرشی دڕندانەش بەکاردێت کەفەرمانێك دێت (أمر) وەك شڤان پەر وەر دەڵێ : ((فەرمانە ، دیسان فەرمانە۰۰۰۰))۰

★حەدیسی مەشهور :

بریتییە لەوفەرموودانەی کەچەند کەسێك گێڕاویانەتەوە۰

★قیاس : لەزاراوەدا بەیەکگەیاندنی ئەوحالەتەیە کەدەقی لەسەرنییە۰

٭المقيس عليه (الاصل) : واتا ئەوەی کەقیاسەکەی دەکرێتە سەر٠
٭المقيس(الفرع): واتاقیاس کراوەکە ئەوحالەتەیە کەدەمانەوێ قیاسی بکەین لەسەرئەصڵدا٠
٭العلة :
بریتییە لەو وەسفە هاوبەشەی لەنێوان فەرع و ئەصڵەکەدایەوکۆیان دەکاتەوە٠
قیاس لەجینایات ناکرێ ، چونکە شەریعەتی ئیسلام کاربەبنەمای (لاجريمه ولاعقوبه الابا لنص) دەکات٠
٭مەکروه لەزمان دا واتا شتی نەشیاوو بێزراو ، لەزاراوەدا بریتییە لەوشتەی نەکردنی با شترەلەکردنی بەجۆرێك نەکردنی مایەی پاداشتەوکردنی سزای لەسەرنییە بێگومان هەرکا رێکی خراپ ئەگەردەق لەسەرحەرامبوونی نەبوو ئەوا مەکرِوهە ، زۆرینەی زانایانیش وتوو یانە ئەنجامدەری کاری مەکرِوه شایستەی سزا نییە ، بەلاّم ڕەنگە شایستەی لۆمە و گلەیی بێت٠
٭موباح :
موباح واتا ڕێپێدراو ، لەزاراوەدا هەرشتێك مرۆڤ سەرپشك کرابێت لەنێوان کردن و نەکرد نی دا٠
٭تاڤگە :
بریتییە لەتەوژمی ئاو بەتوندوتیژی هاتنە خوارەوەی لەشوێنێکی بەرزەوە بۆ شوێنێکی نز مایی٠
٭ئاوبار :
بەواتای ئاوهێنەر (ئاو + بارکردن) ، ئەوشتەیە کەبەهۆیەوە ئاولەجێگەیەکەوە بۆجێگەیە کی تردەگوازێتەوە٠
پشوودان :
حەسانەوە ، پشوولەوەوەهاتووە٠
تاووتوێ :
بریتییە لەلێکدانەوەوبیرلێکردنەوە٠
دەرمان : دار + مان

زەیستان : ژنێ کەتازە منداڵی بووە٠

٭کینایە :

وشەیەك یان چەند وشەیەکە یان ڕستەیەکە دوو واتای هەیە ، مەبەست واتای ڕواڵەتی ئەو قسەیەنەبێت٠کینایە هەرهەمان ئیدیۆمە٠وەك :

ئاگرلەچاوی دەبارێ : بەیەکێك دەوترێ زۆرتوڕەبێ٠

ئاگرلەسەرپشتی دەکەمەوە : واتاخراپی بەسەردەهێنم و سزایەکی ئەوتۆی دەدەم کەهەرگیز بیری نەچێتەوە٠

ئاگری گرتووە : بریتییە لەیەکێك کەزۆرببزوێ٠

ئالقەلەگوێ : فەرمان جێ بەجێ دەکات٠

ئاوبەئاگرداکردن : بریتییە لەکوژاندنەوەی ئاژاوە و فیتنە و ئاشووب٠

ئاوخواردنەوەیە : بەکارێکی زۆرئاسان دەوترێ٠

سوتاندیان : توشی زیان و ئازارێکی گەورەیان کرد٠

٭جەوان (غلام) :

ئەوانەن کەتازە سمێڵیان هاتووە٠

٭فتی : تازە پێگەیشتوو

٭صبیان : کۆی (الصبی)

٭الصبایا : کۆی (الصبیە) بۆکچان

٭الصبی : منداڵ

٭حفید :

منداڵی کوڕ

٭نوا :

گوندێکە لەجۆلان سەربەدیمەشق٠

٭جەلد :

لە(جلد)ەوە هاتووە واتا پێست٠

٭لەکرمانجی ژووروو وشەی ڕێبەرهەیە بەرامبەربەوشەی ڕابەرلەکرمانجی ناوەڕاست ، ڕابە

روشەیەکی فارسییە لەئەسڵدا لە (ڕاه)ی فارسییەوە واتا (ڕێ) ، بەڵام ڕێبەرلە (ڕێ + بەر) هاتووە ، ڕابەریش لە (ڕاه + بەر) هاتووە ، کەلە (ڕاه)ی فارسییەوە وەرگیراوە لەبەرئەوە و شەی (ڕێبەر) کوردییەکی تەواوترە٠

⋆سەرمەشق :

مەبەست لەزاراوەی سەرمەشق ئەوەیە لەنموونەیەك نموونەیەکی تردروست بکەیت بۆنموو نە وێنەیەك لەبەرامبەر خۆت دانێی وێنەی بکێشیتەوە لەم حالەتەدا وێنەی یەکەم بەسەر مەشق دادەنرێت٠

⋆سەفسەتە :

وشەیەکی یۆنانییە بە واتای بەڵگە و پێوەری پووچ و بێ بنەماو بەهەڵەدابردنی هەست و شتەئاشکراودیارەکان٠

⋆پیتی بەستنەوە : نابێ بەوشەی یەکەمەوە بنووسێنرێ ، بەڵکو دەخرێتە ناوەندی ئەودوو وشەیەوە کەبەیەکەوە دەبەسترێنەوە بۆنموونە نابێ بنووسین کەرتوپەرت ، بەڵکودەبێ بەو شێوەیە بنووسین کەرت و پەرت ، بەڵام ئەو وشانەی کەلەبنەڕەت دا لەدوو وشە پێکهاتوون (واو)ەکە دەنوسێنرێ بەوشەی یەکەمەوە بۆنموونە دەنوسین تەنگوچەڵەمە ، هەڵسوکەوت نەك تەنگ و چەڵەمە ، هەڵس و کەوت٠دڵ سۆز ، دڵسۆز هەردووکیان ڕاستن ، بەڵام دووە میان جوانترە لەیەکەمیان ، هەروەها وشەی پێ لێ نان بەچەند جۆرێك دەنوسرێ : پێ لێ نان ، پێ لێنان ، پێلێنان هەرسێکیش ڕاستە نوسەر بەئارەزووی خۆی کامیان هەڵدەبژێرێ

⋆لەشێوەی کرمانجی ژووروو لامی قەڵەو نییە:

گول : کرمانجی ژووروو

گوڵ : کرمانجی ناوەڕاست

⋆ئنستیتیوت :

دەزگایەکە تایبەتە بەکۆکردنەوە ، ئەرشیفکردن ، بلاّوکردنەوە٠

⋆اعتکاف :

لەزمان دا واتا وابەستەبوون : {ماهذه التماثیل التی أنتم لها عکفون} الأنبیاء : ٥٢

**بەلاّم لەشەرعدا واتا مانەوە لەمزگەوت بەمەبەستی خواپەرستی٠وە ئیعتکاف لەمزگەوت دا دەبێت واتا لەماڵەوە نابێت٠**

((من أحب منكم أن يعتكف فليعتكف)) رواه البخاري ومسلم٠

**واتا : ((هەرکەس لەئێوە پێی خۆشە بمینێتەوە ، ئیعتکاف بکات بابیکات))٠**

**★زانست لەقورئان و سوننەت دا مەبەست پێی زانستی شەرعی یە٠**

**★ڕۆژی (٢٠) بیستی مانگی حوزەیران شەودەست بەدرێژبوون دەکات٠**

**★(١٠)دەی مانگی تەمموز،یەکەم ڕۆژی چلەیە٠(٢٧)بیست وحەوتی ئەومانگە وەرزی هاوینە٠**

**★ڕۆژی (٧)حەوتی مانگی ئاب ئەستێرەی گەلاوێژهەڵدێ٠**

**★ڕۆژی (١٨)هەژدەی ئاب چلە تەواودەبێ٠**

**★ڕۆژی (١٣)سێزدەی مانگی ئەیلوول هاوین تەواودەبێ٠**

**★لە (١٤)چواردەی مانگی ئەیلوول وەرزی پایزە٠**

**★(١٩) نۆزدەی مانگی ئەیلوول ئەستێرەی سیوەیل هەڵدێ٠**

**★(٢٢)بیست ودووی ئەیلوول کەپرەشینەیە٠**

**★(١)یەکی تشرینی یەکەم شەووڕۆژبەرامبەردەبن٠**

**★(١٣) سێزدەی کانوونی یەکەم وەرزی پایزتەواودەبێ٠**

**★(١٤) چواردەی کانوونی یەکەم ، یەکەم ڕۆژی وەرزی زستانە٠**

**★(٢٠) بیستی کانوونی یەکەم شەوبەرەودرێژبوون دەچێ٠**

**★(٨) هەشتی کانوونی دووەم سەرەتای ڕۆژدرێژبوونە٠**

**★(١٤) چواردەی کانوونی دووەم حەوتەمین ڕۆژی چلەی زستانە ، یەکەم ڕۆژی برایمی مەلا زیندینانە٠**

**★(٢٨) بیست وهەشتی کانوونی دووەم یەکەم ڕۆژی مێرەمە٠**

**★(١٦) شانزەی شوبات چلەی زستان تەواو دەبێ٠**

**★(١٠) دەی ئادار سەرمای پیرەژنە٠**

**★(١٣)ی ئادار وەرزی زستان تەواو دەبێ٠**

**★(١٤) چواردەی ئادار یەکەم ڕۆژی بەهارە٠**

**★(٢١) بیست ویەکی ئادار نەورۆزوسەری ساڵی کوردییە٠(ئەوزانیارییانەم لەگۆڤاری هەرێمی**

**کوردستان ژماره (٤٩٩)ی ساڵی (٢٠٠٩) لەبابەتێکی عەزیزی مەلا ڕەش وەرگرتووە)٠**

**٭ئاینی سیخی :**

**بریتییە لەتێکەڵکردنی ئاینی ئیسلام و هیندۆس٠وشەی سیخ وشەیەکی سەنسکریتی یە بە مانای شوێنکەوتوو یان هەوادار دێت٠دانەری ئەم ئاینە کەسێکە بەناوی (ناناك) کەلەساڵی ( ١٤٦٩م) لەخێزانێکی هیندۆس لەدایکبووە٠ناناك داوای لەخەڵك دەکرد تەنیاخودا بپەرستن د اوای دەکرد شوێنکەوتووەکانی پێنج فەرزە نوێژبکەن و (٣٠)سی ڕۆژبەڕۆژووبن مەی حەرا م کرد ، خواردنی گۆشتی حەلال کرد بەتایبەتی گۆشتی مانگا٠سیخەکان بڕوایان بە (کسیا) هەیە واتا قڕنەبڕین تاکومردن ، هەروەها لەبەرکردنی شەرواڵ کەشێوەکەی سپییە٠(گۆڤار ی هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٢٧)ی ساڵی (٢٠٠٩) ، مامۆستاکابان عبدالکریم شێخ عەلی)٠**

**٭بریکارنامە :**

**بریتییە لەگرێبەند (عقد) ، کەبەهۆیەوە یەکێك یەکێکی دیکەلەجێگەی خۆی دادەنێت وا تا دەیکات بەریکاری خۆی٠**

**٭جۆرەکانی بریکارنامە :**

**یەکەم – بریکارنامەی گشتی** (الوکالة العامة) :

**بەهۆیەوە بریکاردار (الموکل) گشت مافەکانی خۆی دەدات بەبریکار (الوکیل)بۆئەوەی لەجیا تی ئەوکارەکانی جێبەجێ بکات٠**

**دووەم – بریکارنامەی تایبەت** (الوکالة الخاصة) :

**بریکارەکە دەتوانێ ئیشەکی دیاریکراو لەجیاتی بریکاردار بکات بۆنموونە ئەگەربریکارنامە کە تایبەت بێ بە بەناوکردنی مولکێك دەبێ ژمارەی ئەومولکەی لەسەر دیاری بکرێت دەبێ بریکاردار (الموکل) زۆرئاگاداربێ ، چونکە ئەگەربریکارنامەی گشتی بکات و مەبەستیش تە نیامولکێك بێت بۆنموونە تەنیائۆتۆمبێل بێت ، بریکار (الوکیل) دەتوانێت گشت مولکەکانی بەکاربێنێت واتا دەتوانێت گشت مولکەکانی بفرۆشێت٠**

**٭زورکڤان :**

**سەیرانگایەکی هەمیشەییە دەکەوێتە باکوری ڕۆژهەلاتی دامێنی چیای (پێرس) و نزیکەی**

(١٠)ده كيلۆمەتر لەچياى (شيرن)ەوە دووره٠لەبارەى ماناى حەرفى وشەكە :
يەكەم : لە (زۆر + كڤان) هاتووە ، كڤانيش بەواتاى پێچى ڕووبار٠گوايە لەكۆن دا ڕێڕەوى ڕ ووبارى زێى گەورە پێچێكى گەورەى لەدەستە ڕاستى گوندەكە دروست كردووە٠
دووەم : لە (زۆر + گڤاند) هاتووە ، گڤانديش واتاكەى بريتييە لەلێژايى واتا زۆرلێژايى٠
⋆مەسيح لەزمانى عيبرى جولەكەدا بە(ماشيح) ناوبراوە بەزمانى عەرەبيش بە(مەسيح)٠
ئيبن عەبباس دەڵێ : ((لەبەرئەوە حەزرەتى عيساناوبراوە بەمەسيح ، چونكە هەركات دە ستى هێنابێت بەسەر جەستەى كەسێكى نەخۆش دا خواى گەورە شيفاى بۆناردووە وچاكبۆ تەوە لەونەخۆشييە))٠
طبرى دەڵێ : ((خواى گەورە سرپويەتييەوە و پاكى كردۆتەوە لەهەموو تاوانێك))٠
⋆نەصرانى ، وتراوە ئەم ناوە دەگەڕێتەوە بۆگوندى (ناصر) كەشوێنى لەدايكبوونى عيساى كوڕى مەريەمە (سەلامى خواى لێ بێ) ، بەلأم لەزاراوەدا واتا سەرخەران وشوێنكەوتووانى عيساى كوڕى مەريەم (سەلامى خواى لێ بێ)٠
⋆كەپرە شينە :
واتا كەپرى سەوز ، دەڵێن جەژنێكى جولەكانە بەماناى ماڵێك كەپرێك دروست دەكەن بە ميوەوداورەدەخت وڕووەكى سەوز داى دەپۆشن ، دواى جەژن ميوەكان دەخۆن٠بەلأم لە هە ندێ جێگا كەپرە شينە بەونمەبارانەى سەرەتاى وەرزى پايزدەڵێن٠
⋆عەقل لەزمان دابەماناى بەستنەوە دێت، هەربۆيە عەرەب بەڕيشمەى ئاژەڵ دەڵێن:(عقال) واتا ئەوشتەى ئاژەڵى پێ كۆنترۆڵ دەكرێت٠
⋆وشەى خەليفە لە (خلف) هاتووە واتا (پشت) پێچەوانەى بەردەم يانى كەسێك لەدواى كە سێكى ترەوەبێ لەجێگەى كەسێك دابنيشێ وكارێك ئەنجام بدات٠
⋆ابن مسكويە :
ئەبوعەلى ئەحمەد كوڕى مسكويە خەڵكى ئەسفەهانە مێژوونووس وزانايەكى كيمياوى بووە لە (١٠٣٠م) كۆچى دوايى كردووە٠
⋆جهاد :
وشەى جيهاد لە (جهد) يانى تواناوڕەنج وزەحمەتى ئەوەيە كەسێك تەواوى تواناى خۆى دە

**خاتەکار٠**

**٭موعتەزیلە :**

**سەرگوزشتەی دروستبوونی موعتەزیلە دەگەڕێتەوە بۆ (واصلٙ بن عەتا) کەڕۆژێك لەمزگەو ت کابرایەك پرسیارلەحەسەنی بەصرِی دەکات دەڵێ: حوکمی موسوڵمانێکی گوناهکارچییە؟ حەسەنی بەصرِی دەڵێ : ئەوکەسە هەرموسوڵمانە٠واصلٙ بن عەتا وتی : وەك کەسێك لەمە ککە بۆمەدینە دەچێت لەوکاتەدا لەهیچیان نییە٠بەهەمان شێوە موسوڵمانێك کەگوناه دەکا ت هەنگاوێك لەئیمان دووردەکەوێتەوە ، هەنگاوێك لەکوفرنزیك دەبێتەوە نەکافردەبێ بەم کارە ، نەموسوڵمانە٠دوایی واصلٙ دانیشتنی خۆی لە حەسەنی بەصرِی جیاکردەوە هەربۆیە ناونران موعتەزیلە ، کەلە (أعتزال) هاتووە واتا (گۆشەگیری)٠**

**تێبینی :-**

**ئاینی ئیسلام ئادەمیزادی دابەشکردووە بۆسەردووگرۆپ : (کافر ، موسوڵمان) بۆیە حوکمی موسوڵمانێکی گوناهکار ، ئەوکەسە هەرموسوڵمانە٠**

**٭هۆنراوە :** النظم

**٭هۆنەر :** الناظم

**٭توێشوو : زەخیرە**

**٭ئیبن ڕەجەبی حەنبەلی ، ئیبن کەسیر لەقوتابییەکانی ئیبن قەییمی جەوزی بوون٠**

**٭دانراوەکانی ئیبن قەییمی جەوزی :**

**١ — الفوائد**

**٢ — الروح**

**٣ — مدارج السالكين بين منازل اياك نعبد واياك نستعين**

٤ – اجتماع الجيوش الأسلامية على غزو المعطلة والجهمية

٥ – أحكام أهل الذمة

**٦ — اعلام الموقعين عن رب العالمين**

**٧ — بدائع الفوائد**

٨ – تحفة المودود في أحكام المولود

٩ – الجواب الكافي

١٠ – روضة المحبين

١١ – مفتاح دار السعادة

١٢ – الصواعق المرسلة على الجهمية والمعطلة

١٣ – طريق الهجرتين وباب السعادتين

١٤ – محبة الله عزوجل

١٥ – اغاثة اللهفان من مصائد الشيطان

**★یەکێك لەکوڕەکانی جەعفەری صادق ناوی ئیسماعیله ، شیعەی ئیسماعیلی بەناوی ئەوەوە ناونراوە٠**

**★موسای کازم کوڕی جەعفەری صادقە٠**

**★ئیبن عەساکر :**

**زاناومێژوونووس ناوی(قاسم عەلی کوڕی حەسەنی کوڕی هیبەتوالله‌کوڕی عەساکردیمەشقی )یە ساڵی (١١٠٥) م لەدایکبووە ، لەبەرهەمەکانی (تاریخ دمشق)ە٠**

**★زەهەبی :**

**ناوی (شمس الدین أبوعبدالله حافز)ە ، قوتابی(ئیبن تەیمییەی حەرانی) بووە ، لەنوسراوەکانی** (سیر اعلام النبلاء ، تاریخ الأسلام)**ە٠**

**★نەواوی :**

**یەحیای کوڕی شەرەف ، ساڵی (٦٣١)ك لەگوندی نەوا حۆرانی شام لەدایکبووە ، ساڵی (٦٧٦)ك کۆچی دوایی کردووە ، لەنوسراوەکانی** (ریاض الصالحین)**ە٠**

★البداية والنهاية :

**لەبەرهەمە ناوازەکانی (ئیبن کەسیر)ە ، باس لەسەرەتاکانی دروستکردنی جیهان و دروستکردنی باوکە ئادەم و ڕووداوەکانی مێژوو دەکات ، لەچیرۆکی پێغەمبەران و ڕووداوەکانی سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) ودواتردەدوێ٠**

★طوس :

**شارێکی خوراسانە ، شاری مەشهەدی ئێستای لێ بنیات نرا ، گۆڕی فیردەوسی شاعیرلەم شارە**

یه٠

٭ئیمامی غەزالی ساڵی (٥٤٠)ك لەگوندی تابورای سەربەشاری (طوس) لەدایکبووە٠سەبارەت بەناسناوی غەزالی چەند بۆچوونێك هەیە لەوانە :

یەکەم : غەزالی دەدرێتە پاڵ گوندی غەزالە کەگوندێکە لەگوندەکانی نزیك شاری طوس٠

دووەم : باپیری یان باوکی غەزالی سەرقالی کاری هۆنینەوەو فرۆشتنی خوری بووە٠

٭نیسابور یان نیشاپور :

یەکێکە لەشارەکانی ناوچەی خوراسان ، کەدەکەوێتە باکوری خۆرهەلأتی ئێران ، ئەم شارە چەندین زانای پێشکەش کردووە لەوانە : (ئیمامی موسلیم ، ئیمام حاکم) ، هۆکاری ناونانی نیساپور دەگەڕێتەوە بۆناوی (ساپور)ی دەسەلأتدارکەفەرمانی کرد بەدامەزراندنی ئەوشارە٠

**هۆشیاری یاسایی :**

**(لەپەرتووکی ڕێبەری پڕاکتیکی ، دیندارحوسێن ئەحمەد دەرگەڵەیی وەرگیراوە)**

**فەرمانبەر :**

**هەرکەسێك کارێکی هەمیشەیی پێ بسپێردرێت لەکارکردن لەکەرتی گشتی کەدەوڵەت بەرێوەی دەبات وموچەکەی لەدەوڵەت وەربگرێت پێی دەوترێت فەرمانبەر٠**

**دەرماڵە :**

**ئەوبڕەپارەیەیە کەبۆفەرمانبەرخەرج دەکرێت جگەلەموچەی مانگانە٠**

**جۆرەکانی دەرماڵە :**

**١ — دەرماڵەی هاوسەری : ئەودەرماڵەیە بڕەکەی (٥٠٠٠٠) پەنجاهەزاردیناره ئەگەرهاوسەرگیری ئەنجام بدات٠ئەم دەرماڵەیەش تەنیا بۆیەکێك لەهاوسەرەکان خەرج دەکرێت ئەگەر هەردووکیان فەرمانبەربوون ، وەتەنها بۆپیاوەکە خەرج دەکرێت ئەگەرژنەکە فەرمانبەر نەبوو ، بۆژنەکە خەرج دەکرێت ئەگەر هاوسەرەکەی فەرمانبەریان خانەنشین نەبوو وە هیچ دەرامەتێکی تایبەتی نەبێت٠ئەگەرپیاوەکە لەهاوسەرێکی زیاترهەبوو تەنها (٥٠٠٠٠) پەنجاهەزاردیناری بۆخەرج دەکرێت٠(ڕای من ئەوەیە ئەگەرپیاوەکەلەهاوسەرێکی زیاترهەبوو ئەوا چەندهاوسەری هەیە ئەوەندە (٥٠٠٠٠) پەنجاهەزاردینارەی بۆخەرج بکرێت وە تەنیا بۆفەرمانبەرخەرج نەکرێت بۆجگە لەفەرمانبەریش خەرج بکرێت ئەگەر پیاوەکە داهاتی کەم بوو)٠**

**ئەگەرجیابوونەوە ڕووی دا لەنێوانیان دا دەرماڵەکە خەرج ناکرێت٠**

**٢ — دەرماڵەی منداڵ : فەرمانبەرمانگانە بڕی (١٠٠٠٠) دەهەزاردیناری بۆخەرج دەکرێت بۆ هەرمنداڵێك تا (٤)چوارمنداڵ وە ئەگەر فەرمانبەر زیاترلە (٤) چوارمنداڵی هەبوو تەنها بۆ (٤) چواریان خەرج دەکرێت٠ئەم دەرماڵەیە خەرج دەکرێت تامنداڵەکە تەمەنی دەبێتە (١٨) هەژدە ساڵ٠بەڵام ئەگەر منداڵەکان قوتابی بوون دوای تەمەنی (١٨) هەژدە ساڵیش تا تەمەنی (٢٦) بیست و شەش ساڵی خەرج دەکرێت ئەگەرهاتوو قوتابی زانکۆ بوون٠ ئەگەر فەرما**

نبەرکچی هەبوو دەرماڵەکەی بەردەوام دەبێت تا :
١ — دامەزراندنی کچەکەی٠
٢ — شووکردنی کچەکەی٠
٣ — مردنی کچەکەی٠
ئەگەرپیاوەکە هاوسەری تەلاق بدات و منداڵیان هەبێت وە هەردووکیان فەرمانبەربوون کا
مەیان منداڵەکە بەخێوبکات ئەویان دەرماڵەکە وەردەگرێت٠
٣ — دەرماڵەی بڕوانامە :
دکتۆرا ١٠٠٪ لەموچەی مانگانە
ماستەر ١٠٠٪ لەموچەی مانگانە
دبلۆم باڵا ٥٥٪
بەکالۆریۆس ٧٥٪
دبلۆمی تەکنیکی و دبلۆمەکانی تر ٣٥٪
بڕوانامەی دواناوەندی بەگشت لقەکانی ٢٥٪
ناوەندی ١٥٪
سەرەتایی ١٥٪
بێ بڕوانامە ١٥٪
٤ — دەرماڵەی شوێنی جوگرافی : سەنتەری پارێزگاکان (٢٠٠٠٠)بیست هەزاردینار مانگانە ،
سەنتەری قەزاکان جگەلەقەزای پارێزگانەبێ (٣٠٠٠٠) سی هەزاردینار ، سەنتەری ناحییەکا
ن (٤٠٠٠٠) ، گوندەکان (٥٠٠٠٠) پەنجاهەزاردینار ، شوێنە دوورەکان (٦٠٠٠٠) شەست هەزارد
ینار٠
٥ — دەرماڵەی پایە (منصب) : ئەم دەرماڵەیە بۆئەوانەی پۆستی کارگێڕییان هەیە خەرج د
ەکرێت ، بەم شێوەیە :
جێگری بەڕێوەبەری گشتی ٣٠٪ موچەی مانگانە٠
سەرپەرشتیاری پەروەردەیی و بەڕێوەبەری قوتابخانەوپەیمانگاکان (٢٥٪)٠
سەرۆکی بەشە کارگێڕییەکان (٢٠٪)٠

یاریدەدەری بەڕێوەبەروسەرۆکی بەش (١٥٪)٠

دەرماڵەی پۆست لەوەزارەتی خوێندنی باڵا :
ڕاگرەکان (١٥٠٠٠٠٠) ملیۆنێك ونیو٠
یاریدەدەرانی ڕاگروسەرۆك بەشە زانستییەکان و سەرۆك بەشە کارگێڕییەکان لەسەرۆکایە
تی زانکۆو دەستەی فێرکردنی تەکنیکی (٢٥٠٠٠٠) دووسەدوپەنجاهەزاردینارمانگانە٠
بڕیاردەری بەش (١٥٠٠٠٠) سەدوپەنجاهەزاردینار٠
بەڕێوەبەروبەرپرسی یەکەکان (١٠٠٠٠٠) سەدهەزاردینارمانگانە٠
٦ - دەرماڵەی ترسناکی : ئەودەرماڵەیە بەڕێژەی سەدی لەموچەی بنەڕەتی خەرج دەکرێت
بەمەرجێ لە (٢٠٪) کەمترنەبێ ولە (٣٠٪) زیاترنەبێ٠
٧ – دەرماڵەی سەفەر و ئیفاد :
دەرماڵەی سەفەر : ئەگەرهاتوو فەرمانبەربەکارێکی فەرمی ڕەوانەی شوێنێك کرا لەناوعیرا
ق و لەدەرەوەی سنوری شارەوانی ئەوشارەی فەرمانگەکەی تێدایە دەبێت فەرمانگەکە هەمو
وتێچووی سەفەرکردن و هاتنەوەی بۆخەرج بکات٠
دەرماڵەی ئیفاد : ئەگەرهاتوو فەرمانبەرڕاسپێردرا بۆئەنجام دانی کارێکی فەرمی لەدەرەوە
ی عیراق دەبێت فەرمانگەکەی هەموو تێچووی سەفەرکردن و هاتنەوەی بۆخەرج بکات٠
دەرماڵەی سەفەروئیفادیش بریتین لە :
١ – دەرماڵەی گواستنەوە بە ئۆتۆمبێل یان شەمەندەفەر یان فڕۆکە٠
٢ – دەرماڵەی حەسانەوە لە ئوتێل٠
٣ – خەرجی گیرفانی٠
ئەمانەش بەپێی پلەی فەرمانبەرایەتی خەرج دەکرێت٠
٨ – دەرماڵەی دەوام کردنی زێدەکی : کارکردنی فەرمانبەردەگرێتەوە جگە لەکاتژمێرەکانی
دەوامی فەرمی ، بەم شێوەیە خەرج دەکرێت :
هەرکاتژمێرێکی زیدەکی لەڕۆژانی ئاسایی هەفتە ، کرێی کاتژمێرێکی بۆخەرج دەکرێت٠بە
لام هەرکاتژمێرێکی زێدەکی لەڕۆژانی پشووی هەفتە یان پشووە فەرمییەکان هەر کاتژمێر

یك به دووکاتژمێرهەژماردەکرێت ، وەلە دەوامی تێکەڵاو (ڕۆژلەگەڵ شەو) بەکاتژمێرونیو یك هەژماردەکرێت٠هەروەها هەرکاتژمێرێکی زێدەکی لەکارکردنی شەو بەدوو کاتژمێر هە ژماردەکرێت٠

مۆڵەت : ڕێگاپێدانە بەفەرمانبەر بەنەهاتن بۆدەوامی فەرمی بۆماوەیەکی دیاریکراو٠
جۆرەکانی مۆڵەت :
١ — مۆڵەتی ئاسایی : لەیاسادا هاتووە فەرمانبەرمافی هەیە لەهەر (١٠) دەڕۆژ ، (١) یەك ڕۆ ژمۆڵەتی ئاسایی وەربگرێت بەموچەی تەواو ، وەئەگەر وەری نەگرت مۆڵەتەکەی بۆپاشەکە وت دەکرێت٠لەیاسادا نەهاتووە هۆی داواکردنی مۆڵەت ، بەلاَم وەك نەریتێك لەکاری کارگێڕ ی دا بەکاردێت ودەنوسرێت بۆکاری پێویست ئەگەرپشوو کەوتە ناومۆڵەتەکە ئەوابەمۆڵەت هەژماردەکرێت٠ئەگەرفەرمانبەرخانەنشین کرا موچەی مۆڵەتی پاشەکەوتکراوی بۆخەرج د ەکرێت هەتا (١٨٠) سەدوهەشتاڕۆژ وەئەگەرزیاتری هەبوو بەخزمەت بۆی هەژماردەکرێت و ەئەم پارەیە بەپێی دواموچەی بنەڕەتی خەرج دەکرێت بەبێ دەرماڵە تەنها لەسەر بنەمای موچەی بنەڕەتی خەرج دەکرێت٠ئەگەرفەرمانبەرێك ڕاژەی گواسترایەوە بۆسەر میلاکی ما مۆستایەتی مۆڵەتی پاشەکەوتکراوی لەگەڵ دەگوازرێتەوە مافی هەیە لەسالاَنی خوێندن وە ری بگرێت بەمەرجێك زیان بەپرۆسەی خوێندن نەگەیەنێت٠فەرمانبەردەتوانێت خۆی مۆ ڵەت بەخۆی بدات ئەگەرهاتوو فەرمانبەرداوای مۆڵەتی کرد وە بەڕێوەبەرەکەی ڕازی نەبوو مۆڵەتی پێ بدات دەبێ داوایەکەی لەتۆماری هاتوو تۆماربکات وەجارێکی تریش داوا دەکات ئەگەربەهەمان شێوە پێی نەدا وە (٦)شەش مانگ بەسەرداوای مۆڵەتەکە بەسەرچوو دەتوا نێت خۆی مۆڵەتەکە وەربگرێت بەبێ ڕەزامەندی بەڕێوەبەرەکەی٠هەروەها یاسا ڕێگەی دا وە فەرمانبەرمۆڵەتی بێ موچە وەربگرێت بۆماوەی (٢) دووساڵ زیاترنەبێ ئەم مۆڵەتە ما مۆستایانیش دەگرێتەوە٠
٢ — مۆڵەتی نەخۆشی : لەیاسای ڕاژەی شارستانی دا هاتووە : فەرمانبەرمافی هەیە لەهەر ساڵێکی خزمەتی تەواودا (٣٠)سی ڕۆژمۆڵەتی نەخۆشی بەمووچەی تەواو وەربگرێت و(٤٥) چل و پێنج ڕۆژ بەنیوە مووچە بەپێی ڕاپۆرتی پزیشکی فەرمی٠فەرمانبەری نەخۆش بە

نوسراوێکی فەرمی ڕەوانەی نەخۆشخانە دەکرێت و مۆڵەتی نەخۆشی بەفەرمانبەردەدرێت لەماوەی (١)یەك تاکو (٩)نۆ ڕۆژ بەڕاپۆرتی پزیشکی لەنەخۆشخانەیەکی فەرمی تایبەت بە چارەسەرکردنی فەرمانبەران ، کەپزیشکی چارەسەرکاردەستنیشانی ماوەی مۆڵەتەکە دەکات لە ڕۆژێك تاکو نۆ ڕۆژ، بەلاًم ئەگەرهاتوو فەرمانبەرپێویستی بەمۆڵەتی زیاترهەبوو دەبێت ڕەوانەی لێژنەی پزیشکی فەرمی بکرێت وە لێژنە مافی پێدانی مۆڵەتیان هەیە لە (١٠) دە ڕۆژ هەتا (٣) سێ ساڵ بەمووچەی تەواو٠ئەگەرهاتوو فەرمانبەر لەدوای دەوام نەخۆش کەو ت دەکرێت سەردانی نەخۆشخانەی فریاکەوتن یان هەرنەخۆشخانەیەکی تری فەرمی ئەگەر پێویستی بەخەوتن بوو لەنەخۆشخانە دەبێت نەخۆشخانە دوای دەرچوونی ڕاپۆرتێك بدات بەفەرمانبەر وە بە واژووی (٣) سێ پزیشك تیایدا دەستنیشانی ڕۆژی خەوتن و ماوەی مۆڵە تی پێدراو بەفەرمانبەربکات وە کارگێڕی دەبێت مۆڵەت بەفەرمانبەربدات بەپێی ئەم ڕاپۆر تە٠ئەوفەرمانبەرەی تووشی نەخۆشییەکی درێژخایەن دەبێت مافی هەیە (١٢٠) سەدوبیست ڕۆژ مۆڵەتی نەخۆشی بەمووچەی تەواو بەیەکەوەوەربگرێت ئەگەرمۆڵەتی پاشەکەوتکراوی هەبێ وە (٩٠) نەوەد ڕۆژ بەنیوە مووچە٠

مۆڵەتی نەخۆشییە ترسناکەکان وەك : شەلەل ، شێتی ، ٠٠٠هتد (٢) دووساڵە بەڕاپۆرتی پز یشکی لێژنەی پزیشکی فەرمی وەئەگەرفەرمانبەر دوای تەواوبوونی مۆڵەتەکەی چاك نەبۆ وە خانەنشین دەکرێت٠

٣ – مۆڵەتی سك و منداڵ بوون : لەیاسای ڕاژەی شارستانی دا هاتووە فەرمانبەرمافی هەیە مۆڵەتی سك و منداڵبوون وەربگرێت کە ماوەکەی (١٧٢) سەدوحەفتا و دووڕۆژە بەمووچەی تەواو (٢١) بیست ویەك ڕۆژ پێش منداڵبوون ، (٥١) پەنجاویەك ڕۆژیش دوای منداڵبوون ئە م مۆڵەتە بەپێی ڕاپۆرتی پزیشکی لەپزیشکی پسپۆڕ لەنەخۆشخانەیەکی فەرمی دەدرێت کە ڕۆژی پێشبینی کردنی منداڵبوون دەست نیشان دەکرێت٠ئەگەرفەرمانبەری ژن منداڵی دووا نە (جمك)ی بوو ئەوە بەیەك منداڵ هەژماردەکرێت بۆمۆڵەتی سك و منداڵبوون تەنیا (٧٢) حەفتاودووڕۆژمۆڵەتی پێدەدرێت٠ئەگەرهاتووفەرمانبەری ژن پێش تەواوبوونی ماوەی (٢١) بیست و یەك ڕۆژەکە منداڵی بوو لە ڕۆژی منداڵبوونەکە مۆڵەتی سك دەپچڕێت وە مۆڵەتی

منداڵبوون (٥١) پەنجاویەك ڕۆژەكە دەست پێدەكات٠ بۆنموونە فەرمانبەرێكی ژن دوای (١٠) دەڕۆژلەمۆڵەتی سك و منداڵبوون منداڵی بوو مۆڵەتەكەی دەبێت بە (٦١) شەست ویەك ڕۆژ لەجیاتی (٧٢) حەفتاودووڕۆژ٠

٤ – مۆڵەتی عیددە :

لەیاسای ڕاژەی شارستانی دا هاتووە : فەرمانبەری ژن ئەگەرهاتوو هاوسەرەكەی مرد مافی هەیە مۆڵەتی عیددە وەربگرێت ، كەماوەكەی (١٣٠) سەدوسی ڕۆژە بەمووچەی تەواو٠ئەمە ش گونجانە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا لەئایەتی (٢٣٤)ی سورەتی بەقەرەدا هاتووە : {والذ ين يتوفون منكم ويذرون أزواجا يتربصن بأنفسهن أربعة أشهروعشرا}

ماوەی عیددە لەقورئانی پیرۆزدا چوارمانگ ودەڕۆژە كەكۆیەكەی دەكاتە (١٣٠) ڕۆژ٠

٥ – مۆڵەتی دایكایەتی :

فەرمانبەری ژن مافی هەیە مۆڵەتی دایكایەتی وەربگرێت بۆماوەی ساڵێك بەمووچەی تەواو بۆچاودێریكردنی منداڵەكەی ، (٤)چوارجاریش دەتوانێت لەژیانی فەرمانبەری دا ئەم مۆڵە تە وەربگرێت٠ئەگەرهاتوو منداڵەكەی مۆڵەتی لەسەروەرگرت مرد دەبێت دوای (٣) سێ ڕۆژ دەست بەكاربیێتەوە وەك نەریتێك كەپرسە (٣) سێ ڕۆژە٠

*مامۆستایانی زانكۆمافی مۆڵەتی تایبەتییان هەیە لەماوەی ساڵی خوێندن (١٥)پازدە ڕۆژبە مووچەی تەواو وەبۆیان پاشەكەوت دەكرێت وەدەبێ بەشێوەی پچڕپچڕپێیان بدرێت وەنا بێت لەماوەی ساڵی خوێندن لە (٣٠)سی ڕۆژزیاترمۆڵەتیان پێ بدرێت ، بەلاَم مامۆستایانی سەرەتایی وناوەندی و ئامادەیی و پەیمانگاكانی سەربەوەزارەتی پەروەردە مافی مۆڵەتی تا یبەتییان هەیە بۆماوەی (٧)حەوت ڕۆژلەساڵی خوێندن وە دەبێت بەشێوەی پچڕپچڕوەری بگرن ، وەبۆیان پاشەكەوت ناكرێت٠

مۆڵەتی خوێندن :

ئەم مۆڵەتە بەفەرمانبەران دەدرێت لەدەرچوانی ئامادەیی بەرەوسەرەوە بۆبەدەستهێنانی بڕوانامەیەكی بەرزترلەبڕوانامەی خۆی بەمووچەی تەواو٠ئەگەرهاتووفەرمانبەری مۆڵەت پێدراو سەركەوتوونەبوو لەخوێندن دەبێت گشت ئەومووچانەی وەری گرتوون بیگەڕێنێتە وە خەزێنەی دەوڵەت بەشێوازی قستی مانگانە وەماوەكەشی بەمۆڵەتی بێ مووچە بۆئەژمار

دەكرێت جگەلەنەخۆشی ڕێگرلەتەواوكردنی خوێندن بەڕاپۆرتی لێژنەی پزیشكی فەرمی یا
ن كارەساتی ڕێگرلەدرێژەپێدانی خوێندن٠
ئەگەرهاتووفەرمانبەرێك سالێك دواكەوت بەهۆی كەوتن مانگانە مووچەی پێ دەدرێت ، بە
لام وەكوپێشینە لەسەری تۆماردەكرێت دوای تەواوكردنی خوێندن دەبێت بە قستی مانگانە
بیداتەوە ، سالەكەشی بەمۆلەتی بێ مووچە بۆهەژماردەكرێت٠

**سزاکان :**

**یەکەم – سزای سەرنجراکێشان :**

**ئاگادارکردنەوەی فەرمانبەرە بەشێوەی نووسین لەسەرئەوسەرپێچییەی ئەنجامی داوە وئاڕا ستەکردنی بۆچاککردنی ڕەفتاری لەئەرکەکەی٠سەپاندنی ئەم سزایەدەبێتە هۆی دواکەوتنی بەرزکردنەوە یان سەرمووچە بۆماوەی (٣) سێ مانگ٠**

**سەرمووچە** (العلاوة السنوية) **: بریتی یەلەزیادەی سالأنەی مووچەی فەرمانبەر٠**

**بەرزکردنەوە (الترفیع) : بریتی یەلەگواستنەوەی فەرمانبەر لەپلەکەی خۆی بۆپلەیەکی بە رزتر٠**

**نموونە لەسەرسەرمووچەوبەرزکردنەوە :**

**مووچەی بنەڕەتی**

**٢٩٦٠٠٠ دەبێتە ٣٠٢٠٠٠ دەبێتە ٣٠٨٠٠٠ دەبێتە ٣١٤٠٠٠ سەرمووچە (٦٠٠٠)**

**بەچوارساڵ ئینجا بەرزکردنەوە لە ٣١٤٠٠٠ دەبێتە ٣٦٢٠٠٠ بەرزکردنەوە چوارساڵ بۆپلە ٦**

**٣٦٢٠٠٠ دەبێتە ٣٦٨٠٠٠ دەبێتە ٣٧٤٠٠٠ دەبێتە ٣٨٠٠٠٠ سەرمووچە (٦٠٠٠)دینار**

**بەچوارساڵ ئینجابەرزکردنەوە ٣٨٠٠٠٠ دەبێتە ٤٢٩٠٠٠ بەرزکردنەوە بۆپلە ٥**

**٤٢٩٠٠٠ دەبێتە ٤٣٦٠٠٠ سەرمووچە (٧٠٠٠) دینار ٤٣٦٠٠٠ دەبێتە ٤٤٣٠٠٠ ئەگەرمۆڵەتی بێ مووچەی هەبوو وەك خۆی دەمینێتەوە ٤٣٦٠٠٠ – ٤٣٦٠٠٠**

**٤٤٣٠٠٠ دەبێتە ٤٥٠٠٠٠**

**٤٥٠٠٠٠ دەبێتە ٤٥٧٠٠٠ سەرمووچە (٧٠٠٠) دینار ئینجا بەرزکردنەوە ٤٥٧٠٠٠ دەبێتە ٥٠٩٠٠٠**

**٥٠٩٠٠٠ دەبێتە ٥١٩٠٠٠ سەرمووچە (١٠٠٠٠) دینار**

**٥١٩٠٠٠ دەبێتە ٥٢٩٠٠٠**

**٥٢٩٠٠٠ دەبێتە ٥٣٩٠٠٠**

**٥٣٩٠٠٠ دەبێتە ٥٤٩٠٠٠ ئینجا بەرزکردنەوە ٥٤٩٠٠٠ دەبێتە ٦٣٣٠٠٠**

دووەم – بەئاگاهێنانەوە (الأنذار) :
ئاگادارکردنەوەی فەرمانبەرە لەوسەرپێچییەی ئەنجامی داوە سەپاندنی ئەم سزایە دەبێتە هۆی دواکەوتنی لەبەرزکردنەوەوسەرمووچە بۆماوەی شەش مانگ٠

سێیەم – بڕینی مووچە (قطع الراتب) :
بڕینی پاژە (کرێ)ی ڕۆژانەیە لەمووچەی فەرمانبەربۆماوەیەك لە (١٠) دە ڕۆژزیاترنەبێ بەفەرمانێکی نوسراوئەوسەرپێچییەی تێدا دیاری دەکرێ ، کەفەرمانبەرئەنجامی داوە٠ئەمە دەبێتە هۆی دواکەوتنی بەرزکردنەوە یان سەرمووچە بۆماوەی پێنج مانگ لەکاتێکدا بڕینی مووچە لەپێنج ڕۆژزیاترنەبێ ، یەك مانگ لەبەرامبەرهەرڕۆژێکدا، ئەگەرئەم سزایەلەپێنج ڕۆژزیاتربوو٠

چوارەم – سەرزەنشتکردن :
ئاگادارکردنەوەی فەرمانبەرە بەشێوەی نووسین لەوسەرپێچییەی ئەنجامی داوە٠ئەم سزایە دەبێتەهۆی دواکەوتنی بەرزکردنەوە یان سەرمووچە٠

پێنجەم – کەمکردنەوەی مووچە :
بەبڕینی گوژمەیەك دەبێت لەمووچەی فەرمانبەر بەرێژەی ١٠٪ لەمووچەی مانگانەی فەرمانبەربۆماوەیەك لەشەش مانگ کەمترنەبێ لەدووساڵیش زیاترنەبێ٠سەپاندنی ئەم سزایە دەبێتەهۆی دواکەوتنی بەرزکردنەوە یان سەرمووچە بۆماوەی دووساڵ٠

شەشەم – داگرتنی پلە :

سەپاندنی ئەم سزایە دەبێتە هۆی دابەزاندنی پلە بۆماوەی (٣)سێ ساڵ٠

حەوتەم – دەرکردن (فصل) :

لابردنی فەرمانبەرە لەفەرمانبەرایەتی بۆماوەیەکی دیاریکراو کەلەفەرمانی دەرکردن دیاری دەکرێ ، وەدەست نیشانی ئەوهۆکارانەی بوونەتە هۆی سەپاندنی ئەوسزایە بەسەرفەرمانبە ربەشێوەیەك ماوەکە لەساڵێك کەمترنەبێ لە (٣) سێ ساڵ زیاترنەبێ٠

هەشتەم – جیاکردنەوە (العزل) :

دەرکردنی فەرمانبەرە لەفەرمانبەرایەتی بەشێوەی کۆتایی وەنابێ جارێکی تردابمەزرێتەوە لەفەرمانگەکانی دەوڵەت ولەکەرتی گشتی ئەمەش بەبڕیارێك دەبێ کەلەلایەن وەزیروهۆیە کانی تێدادیاری دەکرێت ، لەیەکێ لەم حالەتانەی خوارەوە :-

١ – ئەگەرکردەیەکی ترسناکی ئەنجام دا وادەکات مانەوەی لەڕاژەی دەوڵەت زیان بەبەرژەوە ندی گشتی بگەیەنێ٠

٢ – ئەگەرحوکم درابەتاوانێك لەئەنجامی فەرمانبەرایەتی ئەنجامی دابوو٠

٣ – ئەگەرسزادرابوو بەدەرکردن ، دواتردامەزرایەوە وەکردەوەیەکی ئەنجام دا دەبوو جار ێکی تردەربکرێتەوە ئەم جارەیان دەرناکرێت جیادەکرێتەوە ، ئەم سزایەش توندترین سزا یە٠

سوپاسنامە :

ئەگەرهاتووفەرمانبەرئەرکەکانی فەرمانبەرایەتی بەباشی ئەنجام دا یان زۆرخۆی ماندووکر د ، بۆهاندان ورێزلێنان لەماندووبوونی سوپاس دەکرێت بەشێوەی نوسراو ، کەبۆماوەی یە ك مانگ پێشخستنی پێدەدرێت لەبڕی هەرسوپاسێك بەمەرجێك لە (٣) سێ پێشخستن زیا ترنەبێ لەماوەی یەك ساڵ بۆنموونە ئەگەرفەرمانبەر لەماوەی یەك ساڵ (٤) چوارسوپاسنا مەی پێدرا تەنها (٣) مانگ پێشخستنی پێدەدرێ بۆسەرمووچە یان بەرزکردنەوەی داهاتوو هەروەها کاریگەری سوپاسنامە بەم شێوەیە دەبێ یەك سوپاسنامە سزای سەرنجڕاکێشان هە ڵدەوەشێنێتەوە ، دووسوپاسنامە سزای بەئاگاهێنانەوە هەڵدەوەشێنێتەوە ، وە ئەگەرسێ سو پاسنامە وەیازیاتری وەرگرت سزادرابوو بەسزایەك لەبەئاگاهێنانەوە قورسترٖبوو ئەوا ماوەی دواخستنی پلەبەرزکردنەوەی بۆکەم دەکرێتەوە٠

خانەنشین :

کۆتایی هاتنی پەیوەندی فەرمانبەرە بەفەرمانبەرایەتی ، کەفەرمانبەر خانەنشین دەکرێت لەبەرتەواوکردنی تەمەنی یاسایی یان نەخۆشکەوتن یان خزمەتی زۆری یان مردنی.

هەرفەرمانبەرێك تەمەنی (٦٣) ساڵی تەواوکرد خانەنشین دەکرێت ، بەلاَم مامۆستایانی زا نکۆ هەتا تەمەنی (٦٦) ساڵی بۆ (٧٠) ساڵی ، هەروەها وتاربێژوپێشنوێژخوێنەکان هەتا تە مەنی (٧٠) ساڵی درێژکراوەتەوە لەهەرێمی کوردستان.

ئەگەرفەرمانبەرکۆچی دوایی کرد خزمەتی لە (١٥) پازدە ساڵ کەمتربوو خزمەتەکەی وموو چەکەی بەرزدەکرێتەوە بۆ (١٥) پازدە ساڵ وەمووچەی خانەنشینی بۆجێماوەکانی خەرج دە کرێت.مووچەی خانەنشینی کوڕبەردەوام دەبێ تاتەمەنی (١٨) هەژدە ساڵی ئەگەرقوتابی نە بوو مووچەکەی دەبڕێت ، ئەگەرقوتابی بوو تاتەمەنی (٢٢) بیست ودووساڵی بەمەرجێك ئا مادەیی تەواوکردبێ تاتەمەنی (٢٦) بیست وشەش ساڵی بەمەرجێك لەخوێندنی زانکۆیی دا بێ.بەلاَم ئەگەرهاتوو کوڕەکە پەککەوتەبوو ، پەککەوتەی تەواوی هەمیشەیی مووچەکەی بەردەوام دەبێت ، بەلاَم دەبێت پاش پێنج ساڵ دووبارە پشکنینی پزیشکی بۆئەنجام بدرێتە وە.ئەگەردەرامەتێکی تایبەتی بۆپەیدابوو وەپەککەوتەی دوای تەمەنی (٥٠) پەنجاساڵی بە پەککەوتە ئەژمارناکرێ بۆشایستە بوونی مووچەی خانەنشینی.وەمووچەی کچ بەردەوام د ەبێت تەنها لەم حالەتانە دەبڕدرێت : -

١ – دامەزراندن یان پەیداکردنی دەرامەتێکی تایبەتی.

٢ – شووکردن.

هاوسەریان هاوسەرەکان مووچەی خانەنشینی هاوسەرەکەیان وەردەگرن ئەگەربێ دەرامەت بوون بەردەوام دەبێت تاکوشووکردنیان.وەمێرد شایستەی مووچەی خانەنشینی ژنەکەی دە بێ بەمەرجێك پەککەوتەبێ ، پەککەوتەی تەواوی هەمیشەیی.

مووچەی خانەنشینی باوك بەردەوام دەبێ ئەگەردەرامەتێکی تایبەتی نەبوو یان پەککەوتە بوو.

مووچەی خانەنشینی ژن یان کچەکان بەردەوام دەبیٚ ئەگەرئەمانە شوویان کرد پاشان تەلا
ق دران لەکاتی شووکردن مووچەکەیان بڕدرابوو لەکاتی تەلاق یان کۆچی دوایی هاوسەرەکا
نیان دووبارە مووچەکەیان بۆدەگەڕێتەوە بەمەرجێك هیچ دەرامەتێکیان نەبیٚ٠

پێشینەی هاوسەرگیری :
فەرمانبەرمافی هەیە بۆیەك جارلەژیانی فەرمانبەری دا پێشینەی هاوسەرگیری وەربگرێت
فەرمانبەرمافی نییەبۆهێنانی ژنی دووەم پێشینەی هاوسەرگیری وەربگرێت ئەگەرووەری گر
تبوو بۆژنی یەکەم٠هەروەها ئەوکەسەی ژنی تەلاق دەدات پێشینەکە نایگرێتەوە ئەگەر وەر
یشی نەگرتبێت٠

پێشینەی خانووبەرە :
دەبێت وەرگری پێشینەکە خێزانداربێت وە بۆیەکێکیان خەرج دەکرێت وە دەبێت هیچ خا
نوو و یەکەی نیشتەجێبوونیان نەبێت نەخۆی نەهاوسەرەکەی وەنابێت ڕووبەری خانووەکە
لە (١٠٠) سەد مەترکەمتربیٚ وەمافی هەیە یەك جاروەری بگریٚ٠

## سەرچاوەکان :

نووسینەکانی ئەم کتێبە لەم سەرچاوانەی خوارەوە وەرگیراوە :-

یەکەم – کتێب :

١ – قورئانی پیرۆز.

٢ – صالح عبدالله ابراهیم ، نهێنییە گرینگەکان بۆبەختەوەری ژیان ، چ١ ، چاپخانەی شه هاب ، هەولێر ، ٢٠١١

٣ – خەندە ئیدریس ، لەشکستەوە بەرەوسەرکەوتن ، چ١ ، چاپخانەی ڕۆژهەلاَت ، هەولێر ، ٢٠١٨

٤ – محمد بن عبدالوهاب ، ١٢٧ باس لەباسەکانی جاهیلی ، و : باوکی ڕەییان ، بێ سالَی چاپ ، بێ شوێنی چاپ.

٥ – محمد متولی الشعراوی ، ژیانی بەرزەخ ، و : حوسێن مەلا قادر پێنجوینی ، بێ سالَی چا پ ، بێ شوێنی چاپ.

٦ – سەباح بەرزنجی ، بنەماکانی فیقهی ئیسلامی ، چ١ ، ٢٠١٦

٧ – هەژارعەزیزسورمێ ، کوردوجینۆسایدوئیبادەکردن : هەڵوێستی یاسای نێودەوڵەتی ، چ١ ، چاپخانەی خەبات ، دهۆك ، ١٩٩٨

٨– تاها فەیزی زادە ، فەرهەنگی وشە دووانەکانی زمانی کوردی ، چ١ ، چاپخانەی انتشارا ت صلاح الدین الایوبی.

٩– محەممەد ئەمین هەورامی ، فەرهەنگی زاراوە و ئیدیۆمی کوردی ، ١٩٨٩

١٠– ئیبراهیم ئەحمەدی ، فەرهەنگی کینایە ، چ١ ، ١٣٨٦ی هەتاوی.

١١ – عەبدولوەهاب شێخانی ، فەرهەنگی کات لەکوردەواری دا ، چ١ ، چاپخانەی دارا ، هەو لێر ، ٢٠٠٧

١٢ – ئالاَن دەباتن ، دلَنەواییەکانی فەلسەفە ، و : سەلاح حەسەن پالَەوان ، چ١ ، چاپخانەی سەردەم ، سلێمانی ، ٢٠١٣

١٣ – محمد نور بن عبدالحفيظ السويد ، بەرنامەی پێخەمبەر (درودی خوای لەسەربێ) بۆ پەروەردەی منداڵان ، و : سوهام بەرزنجی ، ڕێدار ئەحمەد ، چ٢ ، نوسینگەی تەفسیر ، هەو لێر ، ٢٠٠٩

١٤ – سەرجەمی بەرهەمەکانی ئەفلاتوون ، و : عیمران هاواری ، بەرگی دووەم ، چ١ ، چا پخانەی گەنج ، سلێمانی ، ٢٠١١

١٥ – جەلال مەحمود عەلی ، ئیدیۆم لەزمانی کوردی دا ، چاپخانەی حسام ، بەغدا ، ١٩٨٢

١٦ – جەمال نەبەز ، دووبابەتی زمانەوانی کوردی ، سلێمانی ، ٢٠١٤

١٧ – جەمال نەبەز ، زمانی یەکگرتووی کوردی ، ١٩٧٦

١٨ – جمال حبيب الله فرج (بێدار) ، هۆرامان و هۆرامی و واتەو وەڵێنا ، بەرگی دووەم ، چ١ ، چاپخانەی ئنستیتیوتی کەلەپوری کورد ، سلێمانی ، ٢٠١٤

١٩ – وریا ئەحمەد ، تەمیرە ، چ١ ، چاپخانەی موکریانی ، هەولێر ، ٢٠٠٨

٢٠ – عەدنان عومەر بەرزنجی ، ڕۆژوو ، چ١ ، ٢٠١٨

٢١ – عائض القرني ، بەتایبەتی بۆلاوان ، و : عماد جلال حبيب الله ، چ٢ ، چاپخانەی پە نجەرە ، ٢٠١٦

٢٢ – فەلەکەددین کاکەیی ، ئاگایی ، چاپخانەی ڕۆکسانا ، هەولێر ، ٢٠١١

٢٣ – محمد عبدالوهاب ، نەهێشتنی گومان لەسەر خواپەرستی موسوڵمانان (كشف الشبهات) ، و : خەلیل ئەحمەد ، چ٣ ، چاپخانەی زانا ، سلێمانی ، ٢٠١١

٢٤ – سادقی هیدایەت ، مرۆڤ و ئاژەڵ ، و : ڕێباز مستەفا ، چاپخانەی سۆران ، ٢٠١٣

٢٥ – عادل شاسواری ، نهێنی خۆشبەختی ، چ١ ، ٢٠١٠

٢٦ – ئامینە صدیق ، بەڵێ قورئان پارێزراوە ، چ١ ، چاپخانەی شڤان ، سلێمانی ، ٢٠١٣

٢٧ – عبود الخزرجي ، أسماؤنا أسرارها ومعانيها ، بيروت.

٢٨ – دیندار حوسێن ئەحمەد دەرگەلەیی ، ڕێبەری پڕاکتیکی ، چ٢ ، چاپخانەی هێڤی ، ٢٠١٤

٢٩ – ناصری سوبحانی ، خەلقی ئادەم ، چ٣ ، ٢٠١٨

٣٠ – كريم الشاذلي ، چەندێك لەژیان دەژیت ؟ ، و : نوری محمد عومەر ، چاپخانەی چوا

رچرا ، سلێمانی ، ٢٠١٤
٣١ – ئیمامی نەواوی ، گوڵزاری خواناسان (بستان العارفین) ، و : هارون نوح تاها ، چ١ ، چا پخانەی نارین ، ٢٠١٧
٣٢ – ئەدهەم شەرقاوی ، لەگەڵ پەیامبەر (درودی خوای لێ بێ) ، و : خالد تۆفیق ، ئازاد عەبباس ، چ١ ، چاپخانەی ڕێنوین ، ٢٠١٨
٣٣ – خواجە محەممەد ئیسلامی پاکستانی ، دیمەنی مەرگ ، و : شێخ عەزیز شێخ صدیق شێخ ئەحمەدی کەسنەزانی ، چ١ ، چاپەمەنی گەنج ، سلێمانی ، ٢٠٠٨
٣٤ – داناعوسمان حەسەن ، مەسیحییەت (عەقیدەوشەریعەت ومێژوویان) ، چ٢ ، چاپخانەی ڕێ نوێ ، ٢٠١٦
٣٥ – ناصری سوبحانی ، بەندایەتی ، چ٣ ، ٢٠٠٧
٣٦ – عەلی وەردی ، ئەفسانەی ئەدەبی بالاْ ، و : کامیل مەحموود ، چ٢ ، چاپخانەی گەنج ، ٢٠١٧
٣٧ – سەید ئەکرەم جەبار ئیبراهیم کەپرانی ، مێرگەی خواناسان.
٣٨ – یوسف حاج ئەحمەد ، قوربانییەکانی خۆشەویستی ، و : لیژنەیەك ، چ٣ ، ٢٠٠٨
٣٩ – عەلی وەردی ، لێکۆڵینەوەیەك لەسۆسیۆلۆژیای مەعریفە ، و : نەوزاد ئەحمەد ئەسو ەد ، چاپخانەی تاران ، ٢٠١٩
٤٠ – کۆمەڵێك نووسەر ، بەڵێ قورئان پارێزراوە وەلاْمی کتێبی ئایا قورئان پارێزراوە؟، چ٢ ، ٢٠١٥
٤١ – سەعدبەزاز ، لەبارەی خوو و ڕەفتاری مرۆڤەوە – دیداری سەعدبەزاز لەگەڵ عەلی وەردی ، و : وەهاب حەسیب ، چ٢ ، چاپخانەی حەمدی ، ٢٠١٩
٤٢ – هەرێم عوسمان ، چەمکی مردن لەزمانی کوردی دا ، چاپخانەی حاجی هاشم ، هەولێر ، ٢٠١٣
٤٣ – نەجم عبدالله ، کۆمەڵگەی ئیسلامی لەنێوان شەرع وفیقە و واقیع دا ، چ١ ، چاپخانە ی ڕۆمان ، سلێمانی ، ٢٠١٧
٤٤ – عەباس چنارانی ، هەزارپەندی پێشینان ، چاپخانەی کاروان ، ٢٠١٣

٤٥ – محەممەد یوسف کوفەن ، چۆن پاکیزەیی چاوم بپارێزم ؟ ، چ١ ، دەزگای چاپ وپە خشی عیرفان ، ٢٠١٦

٤٦ – هەردەوێڵ کاکەیی ، پەندی پێشینان وقسەی نەستەق لەناوچەی کەرکوك دا ، چ١ ، چاپخانەی ئاراس ، هەولێر ، ٢٠٠٨

٤٧ – عبدالکریم بکار ، موسوڵمانی ئیجابی ، و : بەهجەت جەمیل حامد ، چ١ ، ناوەندی ڕا گەیاندنی ئارا ، سلێمانی ، ٢٠١٤

٤٨ – حسام الدین جودت ، کۆسپەکانی حیجاب ، و : غازی ئیسماعیل میرۆستەمی ، چ٤ ، هە ولێر ، ٢٠١٢

٤٩ – ئەحمەد پوشێنی ، کۆباسەکانی دوانگە ، بەرگی دووەم ، چاپخانەی زانا ، ٢٠١٨

٥٠ – عارف قوربانی ، شایەتحالەکانی ئەنفال ، بەرگی سێیەم ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٣

٥١ – واسق غازی ، ئاین و قورخکردنی حەقیقەت ، و : زێبارعەزیزخان مهاجر ، چ١ ، چا پخانەی حاجی قادری کۆیی ، هەولێر ، ٢٠١٦

٥٢ – عبدالدائم الکحیل ، سوڕی ئاولەنێوان زانست وبیروباوەڕدا ، و : سەروەرحەسەن ، چ١ ، ٢٠١٧

٥٣ – قحطان عبدالرحمن الدوري ، بیروباوەڕی ئیسلامی و مەزهەبەکانی ، و : زێبارعزیز خان مهاجر ، نوسینگەی تەفسیر ، هەولێر ، ٢٠١٥

٥٤ – ئیمامی غەزالی ، المقصد الأسنى في شرح أسماء الله الحسنى ، و : عبدالکریم فتاح ، چ١ ، چاپخانەی هێڤی ، هەولێر ، ٢٠١٦

٥٥ – کەریم شەریف قەرەچەتانی ، سایکۆلۆژیای گەشە (منداڵ و هەرزەکار) ، چ١ ، سلێمانی ، ٢٠٠٩

٥٦ – شەمسەددین محەممەد کوڕی ئەبی بەکر (ئیبن قەییمی جەوزی) ، توێشووی ئارامگرا ن و سوپاسگوزاران (عدة الصابرين وذخيرة الشاكرين) ، و : عبدالله گەرمیانی ، چ١ ، چا پخانەی ڕێ نوێ ، ٢٠١٩

٥٧ – سەردارفەقێ حەسەن مستەفا ، سێ گوناه و تاوان لەپەنای ئیسلامدا ، چ١ ، هەولێر ، ٢٠١٨

٥٨ – أبومحمد الحسن بن علي خلف البربهاري ، **شەرحی سوننە ، و : عبدالمجید عبد الحمید ، چ١ ، چاپخانەی نارین ، ٢٠١٤**

٥٩ – **عەلی وەردی ، هێزە کاراکانی نەست ، چ٤ ، چاپەمەنی گەنج ، ٢٠١٨**

**دووەم – گۆڤار :**


١ – کلتوری کورد ، ژمارە (١) ، ٢٠١٥

٢ – تریفە ، ژمارە (٨) ، ١٩٧٩

٣ – تەمەن ، ژمارە (٢) ، ٢٠١٠

٤ – گوڵان ، ژمارە (١٢٠١) ، ٢٠١٩

٥ – هەرێم ، ژمارە (٣٣٦) ، ٢٠٠٥

٦ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٣٥١) ، ٢٠٠٩

٧ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٣٧١) ، ٢٠٠٦

٨ – هەرێم ، ژمارە (٣٤١) ، ٢٠٠٥

٩ – هەرێم ، ژمارە (٣٣٧) ، ٢٠٠٥

١٠ – هەرێم ، ژمارە (٣٦٦) ، ٢٠٠٦

١١ – هەرێم ، ژمارە (٣٣٣) ، ٢٠٠٥

١٢ – هەرێم ، ژمارە (٣٣٥) ، ٢٠٠٥

١٣ – ئۆزۆن ، ژمارە (٢١) ، ٢٠١١

١٤ – ڕەنگین ، ژمارە (٢٢) ، ١٩٨٩

١٥ – ڕەنگین ، ژمارە (٥) ، ١٩٨٨

١٦ – ڕەنگین ، ژمارە (٧) ، ١٩٨٨

١٧ – چارە ، ژمارە (١٥) ، ٢٠١١

١٨ – ئێوە ، ژمارە (٧) ، ٢٠١٠

١٩ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٤١) ، ٢٠٠٧

٢٠ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٩٥) ، ٢٠٠٩

٢١ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥١١) ، ٢٠٠٩

٢٢ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٢٩) ، ٢٠٠٩

٢٣ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٩٩) ، ٢٠٠٩

٢٤ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٩٤) ، ٢٠٠٩

٢٥ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٢٧) ، ٢٠٠٩

٢٦ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٨٩) ، ٢٠٠٨

٢٧ – هەرێم ، ژمارە (٢٦٣) ، ٢٠٠١

٢٨ – هەرێم ، ژمارە (٢٦٥) ، ٢٠٠١

٢٩ – هەرێم ، ژمارە (٢٦٨) ، ٢٠٠١

٣٠ – هەرێم ، ژمارە (٢٦٩) ، ٢٠٠١

٣١ – هەرێم ، ژمارە (٢٧٠) ، ٢٠٠١

٣٢ – هەرێم ، ژمارە (٢٤٥) ، ٢٠٠٠

٣٣ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٨١) ، ٢٠١٠

٣٤ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٣٢) ، ٢٠٠٧

٣٥ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٢٨) ، ٢٠٠٧

٣٦ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٩٣) ، ٢٠١١

٣٧ – هەرێم ، ژمارە (٢٧١) ، ٢٠٠١

٣٨ – ڕوانگە و ڕەخنە ، ژمارە (٨) ، ٢٠٠٣

٣٩ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٥٩٩) ، ٢٠١١

٤٠ – هەرێمی کوردستان ، ژمارە (٤٦١) ، ٢٠٠٨

٤١ – گوڵان ، ژمارە (١٢١٤) ، ٢٠١٩

٤٢ – گوڵان ، ژمارە (١٢١٦) ، ٢٠١٩

٤٣ – هەرێم ، ژمارە (٢٥٠) ، ٢٠٠٠

٤٤ – هەرێم ، ژمارە (٢٢٧) ، ١٩٩٩

٤٥ – هەرێم ، ژمارە (٢٢٨) ، ١٩٩٩

٤٦ – هەرێم ، ژمارە (٢٢٩) ، ١٩٩١

٤٧ – هەرێم ، ژمارە (٣١٤) ، ٢٠٠٤

٤٨ – هەرێم ، ژمارە (٣٢٠) ، ٢٠٠٤

٤٩ — هەرێم ، ژمارە (٣٢١) ، ٢٠٠٤
٥٠ — هەرێم ، ژمارە (٣٢٨) ، ٢٠٠٥
٥١ — نیگا ، ژمارە (١١٤) ، ٢٠١١
٥٢ — گوڵان ، ژمارە (١٢١٩) ، ٢٠١٩

## ناوەڕۆك